

# قوتابیانی قورئان

## سەد ڕووداو و بەسەرهاتی ڕاستەقینەیە

کۆکرنەوە و ئامادەکردنی

**ئازاد بابە عەلی**






چاپی چوارەم
2016



mahweeshop@yahoo.com

00964 770 652 1662

009647504129703

## ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتوك: قوتابیانی قورئان ( سەد رووداو و بەسەرهاتی راستەقینەیە )

کۆکرنەوە و ئامادەکردنی: ئازاد بابە عەلی

چاپ: چاپی چوارەم ۲۰۱٦

نەخشە سازی: نوسینگەی هیوا

چاپخانەی: هێڤی



# قوتابیانی قورئان

# سەد رووداو و بەسەرهاتی راستەقینەیە

کۆکرنەوە و ئامادەکردنی
ئازاد بابە عەلی

چاپی چوارەم
٢٠١٦ز



# پێشەکی

ئەوانە چیرۆکی بەر ئاگردان نین.. ئەو چیرۆکانە لەوانە نین کەهەر تەنها بۆ سەربادان و بەسەربردنی کات بگێڕدرێتەوە، ئەوانە چیرۆکی ئەفسانەیی و خەیاڵی نین.

ئەوانەچەندبەسەرهاتێکی ڕاستەقینەن کەبەسەرقوتابییە پێشینەییەکانی قورئان هاتوون، ئەو قوتابییانەی کەهەموو شتێکیان لەسەر ئاینی ئیسلامی پیرۆز داناوە و هیچ بایەخیان بەگیان و ماڵ و سامان و هەموو شتێکی تری ئەو دونیایە بێ ئومێدە نەداوە و هەموویان کردۆتە قوربانی بۆ خوای گەورە و لەرێگە ئەو ئاینەیان داناوە.

ئێمەش کەئەو بەسەرهات و ڕووداوانە دەخوێنینەوە یان گوێمان لێیان دەبێت، دەبێت بیرمان تەنها بۆ ئەو بچێت کەدەرس و سوودیان لێ وەربگرین و بیانکەینە چرای رێگەی تاریکمان، چونکە بەراستی هەر بەسەرهاتێك لەوانە وێنەیەکی پاڵەوانێتی یان پیاوانە یان مرۆڤایەتی یان... یان... تیادایە.

دەرس و سوود وەرگرتنیش لەم ڕووداوانە ئەوکاتە ڕاست دەبێ ئەگەر هاتو موسڵمان تەماشای ئەو قوتابییانە، بکات و لەخۆی بپرسێ: ئەرێ ئایا من تاکو ئێستا ئەوەندەی ئەوان خۆم ماندوو کردووە؟ ئەوان بەم شێوەیە خۆیان ماندوو کردووە و هەوڵیان داوە ئەوجا لەئاگری جەهەننەم قوتار بووینە، ئایا دەکرێ منیش وەکو ئەوان لێی قوتار ببم لەکاتێکا هێشتا بەچارەکی ئەوان خۆم ماندوو نەکردووە؟ کەپیاو قوتار بووینە، ئایا دەکرێ منیش وەکو ئەوان لێی قوتار ببم لەکاتێکا هێشتا بەچارەکی ئەوان خۆم ماندوو نەکردووە؟ کەپیاو ئەو پرسیارانە لەخۆی دەکات (خۆی لەگەڵ ئەوان بەراورد دەکات) بەجوڵە یان بەجوانی خۆی دەناسێ و لەخۆی دەگات و دەزانێ چی لەسەر شانییە، واتە کەدیتی هێشتا زۆری ماوە وەکو ئەوانی لێ بێ ئەوە مانای ئەوەیە هێشتا زۆری ماوە لەئاگری جەهەننەم قوتار ببێ.





## ١- دەوڵەمەندی و هەژاری

پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) ڕۆژێك لەگەڵ موسڵمانێکی هەژار دانیشتبوو، موسڵمانێکی دەوڵەمەندیش هاتە لایان و هیچ جێگەی نەبوو لێی دانیشێ، بەڵام لەتەنیشت هەژارەکە جێگەی دەبۆوە.

پێش ئەوەی لەتەنیشتی دابنیشێ لچکی جلەکانی خۆی کۆکردەوە ئینجا دانیشت، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) کەئەمەی دیت پێی ووت: ئەوە بۆچی جلەکانت کۆکردەوە، نەوەك کابرا تووشی دەوڵەمەندی بکەی، یان نەوەك تۆ تووشی هەژاری بکا؟

قسەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کابرای دەوڵەمەندی پەشیمان کردەوە و زۆر دڵی تەنگ کرد، بۆیە ووتی: پێغەمبەری خوا با سزای ئەو دەروونەم بێ کەوای پێ کردم من نیوەی ماڵی خۆم بەو هەژارە دەبەخشم، پێغەمبەریش لەهەژارەکەی پرسی: ئەی عەبدوڵڵا تۆ وەری دەگری؟ هەژارەکە ووتی: نەخێر، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی بۆچی؟ هەژارەکە ووتی: لەوە دەترسم وەری بگرم دەوڵەمەندبم دوایی منیش ئاوا خۆم لەخەڵکی بەگەورەتر بێتە بەرچاو و لافیان لەسەر لێبدەم.

## ٢- ئەو باخچەیەم ناویّ؟

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضی الله عنه) دەگێڕێتەوە و دەڵێ: عومەری کوڕی خەتتاب باخچەیەکی دار خورمای هەبوو، رۆژێك کەچووبوە باخچەکەی هەتا هاتەوە دیتی خەڵکی نوێژی عەسریان کردبوو، عومەر (رضی الله عنه) ووتی: ئێمە هەر بۆ خواین و هەر بۆ ئەویش دەگەڕێینەوە، ئەو باخچەیە بووە هۆی ئەوەی نوێژی عەسرم بەجەماعەت لەدەست بچێ، دە شاهید بن ئەی خەڵکینە ئەوا کردم بەسەدەقە بەسەر موسڵمانان با بێتە کەفارەتی ئەو کارەی کەکردم.

## ٣- رووخۆشی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) چەند درهەمێکی لەزەیدی کوڕی سەعەنە قەرز کردبوو، بەڵام کاتی دانەوەکەی هاتبوو جارێکیان کاتێ پێغەمبەر لەناو یارەکانی دانیشتبوو ئەو زەیدی کوڕی سەعەنەیە کەخۆشی زانایێکی جوولەکە بوو هاتە لایان و رێزی موسڵمانەکانی بڕی و خۆی گەیاندە کن پێغەمبەر، ئەوجا توند یەخەی پێغەمبەری گرت و ووتی: موحەممەد.. بێنە قەرزەکەم، ئێوەی بەرەی هاشم هەروان، هەمیشە قەرزی خەڵکی دوا دەخەن.

عومەری کوڕی خەتتاب کەلەکۆڕەکە دانیشتبوو دەستی خستە سەر دەسکی شمشێرەکەی و ووتی: پێغەمبەری خوا رێگەم بدە لەسەری بدەم، پێغەمبەریش فەرمووی: نا عومەر.. مافی خۆیەتی، تۆ هەر ئەوەندەت پێ دەکرێ کەبەو بڵێی بەشێوەیەکی جوان داوای قەرزەکەی خۆت بکاتەوە و بەمنیش بڵێی بەچاکی قەرزەکەی بدەوە.



جوولەکەکە ووتی: بەو زاتەی کەتۆی بەهەق ناردووە ئەی موحەممەد بۆ قەرزەکە نەهاتبووم چونکە من زۆر باش دەزانم هێشتا کاتی دانەوەی قەرزەکە نەهاتووە، بەڵکو بۆ ئەوە هاتبووم خورەوشتت تاقی بکەمەوە، من نەهاتووە، بەڵکو بۆ ئەوە تۆم لەتەورات خوێندۆتەوە و هەمووشیانم لەتۆ دیتبوو تەنها یەکێکیان نەبێ ئەوە ئەویشم دیت، ئەو سیفەتەش دڵ نەرمیە تۆ هەرچەند کابرایەکی نەخوێندەواری، بەڵام ئەوەندەش دڵ نەرمی، بۆیە (اشهد أن لا اله إلا الله وأشهد أنك يا محمد رسول الله)، هەرچی قەرزەکەشمە ئەوا کردمە سەدەقە بەسەر موسڵمانە هەژارەکان.

## ٤- کردەوەی چاك

رۆژێك دوای ئەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنوێژی نیوەڕۆ بۆوە رووی کردە یارەکانی خۆی و لێی پرسین: کێ لەئێوە ئەورۆکە بەرۆژووو بووە؟

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی من پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی کێ لەئێوە ئەورۆ شتێکی بەهەژارێك بەخشیوە؟

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی من پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی کێ لەئێوە ئەورۆکە سەری لەنەخۆشێك داوە؟

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی: من پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی کێ لەئێوە ئەورۆکە مردوێکی شاردۆتەوە؟

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی: من پێغەمبەری خوا.

پێغەمبەر فەرمووی: ئەدی کێ لەئێوە ئەورۆکە دوو کەسی شاد کردۆتەوە؟

ئیممای ئەبوبەکر ووتی: من پێغەمبەری خوا.



پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: هەر موسڵمانێك كارێك لەم كارانە ئەنجام بدا ئەوا لەرۆژی قیامەت دەرگایەك لەدەرگاكانی بەهەشت بانگی دەكات و دەڵێ وەرە بۆ لام (وەرە لێرە برۆ ژووری).

ئیمامی ئەبوبەكر ووتی: ئەدی ئەوەی هەمووی بكات؟ پێغەمبەر فەرمووی؟ هەندێ كەس لەئوممەتی من هەن لەرۆژی قیامەت هەموو دەرگایەكانی بەهەشت تێكڕا بانگی دەكەن و پێی دەڵێن وەرە بۆ ئێرە، ئەبوبەكر تۆش یەكێكی لەوان.

## ٥- با بۆ برایەكەم بێت

جارێك ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) لەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) شكایەتی لەئیمامی عەلی (رضی الله عنه) كرد و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا هەتا من سەلام لەعەلی نەكەم ئەو سەلامم لێ ناكا، هەموو جار هەر دەبێ من یەكەم جار سەلام بكەم، پێغەمبەریش ناردییە دوای ئیمامی عەلی و پێی ووت: بۆچی تۆ سەلام لەعومەر ناكەیت؟

ئیمامی عەلی لەوەڵامدا ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووتە هەركەسێ یەكەم جار ئەو سەلام لەبرای ئاینی خۆی بكات ئەوا خوای گەورە خانووێكی لەبەهەشت بۆ تەرخان دەكات، لەبەرئەوە من دەمویست عومەر یەكەم جار سەلام بكات تاكو ئەو خانوەی بەهەشتی بەركەوێ.

## ٦- لەبرسان

رۆژێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەختی نیوەڕۆ لەماڵی هاتە دەرەوە، لەرێگا چاوی بەئیمامی ئەبوبەکر کەوت، لێی پرسی: ئەبوبەکر ئەوە بەو نیوەڕۆیە لەدەرەوە چی دەکەی؟! ئەبوبەکر لەوەڵامدا ووتی: لێت ناشارمەوە پێغەمبەری خوا لەماڵەوە هیچمان نەبوو بیخۆین، منیش ئەوەندەم برسی بوو خۆم بۆ نەگیرا و هاتمە دەرەوە.

پێغەمبەر و ئیمامی ئەبوبەکر نەختێك رۆیشتن و ئیمامی عومەریان دیت، پێغەمبەر لێی پرسی: ئەی عومەر بۆچی بەو نیوەڕۆیە هاتوویتە دەرەوە؟ ئیمامی عومەر ووتی: لێتی نەشارمەوە ئەی پێغەمبەری خوا لەبرسان.

دوای نەختێك رۆیشتن ئیمامی ئەبوبەکر و ئیمامی عومەریش لەپێغەمبەریان پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی تۆ بۆچی بەو نیوەڕۆیە هاتبوویە دەرەوە؟ پێغەمبەر فەرمووی: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەوەی ئێوەی هێناوەتە دەرەوە هەر ئەویشە کەوا منی هێناوەتە دەرەوە.

## ٧- بیلال لەسەر مردن

بیلالی کوڕی رەباح (بیلالی حەبەشی) لەسەر مردن بوو، خێزانەکەی هاواری کرد، ئای لەو موسیبەتە گەورەیە، بیلالیش پێی ووت من لەو قسەیە لەگەڵت نیم، بەڵکو بڵێ وای لەو دڵ خۆشیەم، من سبەی دەگەمە پێغەمبەر و برادەرەکانم.

# ٨- تامی شەهیدی

یەکێك لەوانەی کەلەغەزای ئوحد شەهید کران، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (رضی الله عنه) بوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی کوڕەکەی کرد و پێی ووت: ئەی جابر مزگێنییەکت نەدەمێ؟ جابر ووتی: پێغەمبەری خوا تۆ هەمیشە مزگێنی خێرت پێیە، پێغەمبەر فەرمووی: خوای گەورە ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵ کەس نەکردووە، بەڵام لەگەڵ باوکی تۆ ڕووبەڕوو قسەی کرد پێی ووت: ئەی عەبدوڵڵا هەرچیت دەوێ داوام لێ بکە، باوکیشت ووتی: خوای گەورە دەمەوێت جارێکی تر بمگەڕێنیەوە سەر دونیا بۆ ئەوەی بەهاوڕێکانم ڕابگەیەنم کەلەچ خۆشی و ناز و نیعمەتێکم و پاشان جارێکی تریش لەپێناوی تۆدا بکوژرێمەوە، خوای گەورە فەرمووی: ئەی عەبدوڵڵا کەس بۆ ئەو دونیایە ناگەڕێتەوە چونکە ووتومە: (إنهم لا یرجعون) عەبدوڵڵا ووتی خوایە گیان ئەدی هاوڕێیەکانم چۆن دەزانن من لەچی دام؟ خوای گەورە پێی فەرموو من پێیان ڕادەگەیەنم، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە: ﴿ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًۢا ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ وَيَسْتَبْشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا۟ بِهِم مِّنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ﴾ آل عمران: ١٦٩ – ١٧٠.

# ٩- عەبدوڵڵا و پادشای رۆم

ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) لەسەردەمی خیلافەتی خۆی سوپای ئیسلامی بەرەو شام نارد تاکو لەتاغووتی رۆم بدات، چونکە ئەو تاغووتە هەڕەشەی لەدەوڵەتی ئیسلامی کردبوو، کاتێك هێزی ئیسلام گەیشتە شام لەگەڵ لەشکری رۆمەکان بووە شەڕیان، لەم شەڕە عەبدوڵڵای کوڕی حوذافە و کۆمەڵێك موسڵمانی تر بەدیل گیران هەردوویانیان بردە لای (هەرقەل)ی پادشای رۆم، ئەم هەرقەلە ویستی بەزۆر عەبدوڵڵا لەئاین بێنێتە خوارەوە.

بەعەبدوڵڵای ووت: ئەی عەبدوڵڵا ئەگەر ببیە گاور، ئەوا نیوەی ماڵ و موڵکی خۆمت دەدەمێ، عەبدوڵڵا پێی ووت: بەخوای ئەگەر ئەو دونیایەم هەموو بدەیتێ لەسەر ئاینی موحەممەد نایەمە خوارەوە.

هەرقەل پێی ووت: ئاخر ئەگەر نەبیە گاور تووشی ناخۆشترین ئازارت دەکەم، عەبدوڵڵا ووتی: چی دەکەی بیکە، تۆ هەر دەتوانی ئازاری لاشەکەم بدەی، بەڵام لەگەڵ گیانەکەم هیچت پی ناکرێ.

هەرقەل ئەمری کرد لەخاچێکی ببەستنەوە و ئینجا دەست و قاچەکانی تیر باران بکەن تاکو ئازارێکی زۆر بچێژێ، بەڵام بێ سوود بوو، ئەوە بوو عەبدوڵڵا هەر تیرێکی پێ دەکەوت دەیووت: لا إله إلا الله، ئینجا هەرقەل ووتی بیهێننە خوارەوە.

عەبدوڵڵایان هێنایە خوارەوە و بردیانە نزیك ئاوێك کەدەکولا و لەبەر گەرمی بلقی دەکرد، ئینجا هەرقەل پێی ووت: یان دەبێ ببیە گاور یانیش دەبێ خۆت بهاوێیە ناو ئەو ئاگرە، عەبدوڵڵا شەرتی دووەمی هەڵبژارد و لەئاوەکە چووە

پێش، بەڵام پێش ئەوەی خۆی فڕێ بداتە ناوی چاوەکانی فرمێسکیان لێ هاتە خوارەوە.

هەرقەل کەئەوەی بینی پێی ووت: ئەوە دەگری؟!، عەبدوڵڵا ووتی: وەڵڵاهی زۆر باش بزانە کەگریانەکەم لەترسان نەبوو، چونکە من زۆرباش دەزانم ئەگەر بمرم بۆ لای خوای خۆم دەگەڕێمەوە، بەڵام سووم لەوەیە کەتەنها یەك گیان (ڕۆح)م هەیە، خۆزگەم ئەوەبوو کەسەد گیانم هەبوایە ئەوجا با هەموو ئەو گیانانەم لەپێناوی خوای گەورە ئازار بدراباینایە ئەوجا ئەوکاتە دڵەکەم خۆش دەبوو و دەحەسامەوە.

بەم قسانەی عەبدوڵڵا هەرقەل هەر بەیەك جار ئاگری تێ بەربوو ووتی بیهێنن، عەبدوڵڵایان هێنا لەژوورێکیان کرد و ئافرەتێکی جوانیشیان لەگەڵ هاویشتە ژوورێ و دەرگایان لەسەر داخستن، ئافرەتەکە چەند سەعاتێك لەپێش عەبدوڵڵا دەهات و دەچوو بەهەموو شێوەیەك خۆی پێ نیشان دەدا.

پاش چەند سەعاتێك هەرقەل ووتی ئافرەتەکە بێنن با بزانم چیان کردووە؟ ئافرەتەکەیان هێنایە لای هەرقەل، بەهەرقەلی ووت: گەورەم نازانم ئەو کابرایە نەمرۆڤە نەبەرد.. من بەهەر شێوەیەك خۆم پێی نیشان دەدا ئەو دەیوت: لا إله إلا الله و هیچ توخنم نەدەکەوت.

ئەوجارە هەرقەل ئەمری کرد: بەتەنها لەژوورێك دایبنێن و هیچ خواردنیشی مەدەنێ و تەنها ئارەق و گۆشتی بەرازی بۆ ببەن، قسەی هەرقەلیان جێ بەجێ کرد و عەبدوڵڵا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ تەنها ئارەق و گۆشتی بەرازی بۆ دەچوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەگۆشتەکەی خوارد و نەئارەقەکەیشی خواردەوە، کەچوونە لای و دیتیان هیچی نەخواردووە زۆریان پێ سەیر بوو، پێیان ووت ئەوە

چۆن هیچت لێیان نەخواردووە، لەکاتێکا تۆ ناچاری و زگت لەبرسان هاوار دەکا؟ عەبدوڵڵا وەڵامی دانەوە: لەوە ترسام نەوەك دوژمنانی خوا خراپ لەئایینی خوای گەورە بگەن.

کەهەرقەل زانی هیچ شتێك لەگەڵ عەبدوڵڵا سوودی نییە پێی ووت: وەرە سەرم ماچ بکە من بەرەڵات دەکەم عەبدوڵڵا ووتی: نەخێر ئەگەر برا موسڵمانەکانیشم بەرەڵا بکەی ئەوا سەرت ماچ دەکەم، ئەگەرنا ماچی ناکەم، هەرقەلیش بەوە ڕازی بوو.

کەعەبدوڵڵا چوو سەری ماچ بکا، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ووتی: خوای گەورە تۆ دەزانی ئەو کابرایە هاوبەش پەیداکەرە و لەش پیسە، بەڵام ئەگەر لەڕۆژی قیامەت لێت پرسیم بۆچی سەریت ماچ کرد؟ پێت دەڵێم: بەگەورەیی تۆ بۆیە ماچم کرد تاکو برایەکانم بەربدات.

بەم شێوەیە عەبدوڵڵا سەری هەرقەلی ماچ کرد، ئەویش عەبدوڵڵا و موسڵمانەکانی تری بەردا و هەموویان بۆ شاری مەدینە گەڕانەوە، کەبەسەرهاتەکەیان بۆ خەلیفەی موسڵمانان گێڕایەوە، عومەر هەستا سەری عەبدوڵڵای کوڕی حوذافەی ماچ کرد، ئیتر دانیشتووەکان هەموویان یەکە بەیەکە هەڵدەستان و سەری عەبدوڵڵایان ماچ دەکرد.

## ١٠- ئیمامی عومەر خۆی بوو

ئیمامی عومەر و عبدالرحمانی کوڕی عەوف لەشەوێکی تاریکی زۆر سارد لەناو شاردا دەگەڕان، لەپڕ چاویان بەڕووناکییەك کەوت، کەبەپیر ئەو ڕووناکییە چوون دیتیان وا ئافرەتێك و سێ منداڵ لەچواردەوری ئاگرێك دانیشتوون و دیاریش بوو مناڵەکان زۆریان برسی بوو بۆیە هەریەکەیان بەشێوەیەك دەیاناڵاند.

ئیمامی عومەریش چوو بەرامبەر ئاگرەکە دانیشت و لەئافرەتەکەی پرسی: چیت گەرەکە (پێویستە) خوشکی ئاییینم؟ ئافرەتەکە ووتی: عومەر هیچ ئاگامانی لێ نییە، ئیمامی عومەر ووتی: جا عومەر چۆن ئاگای لەئێوە بێ؟

ئافرەتەکە ووتی: چۆن کاروباری ئێمەی بەدەستە ئەوهاش دەبێ ئاگای لێمان بێ.

ئیمامی عومەر هەستا هەر بەو شەوە چووە (بيت المال)ی موسڵمانان و هەندێك گەنم و ڕۆن و هەنگوینی دەرهێنا و بەپاسەوانی بيت المالی ووت بەسەر پشتمیان دابدە، ئینجا بەخۆی و شت و مەکەکەی بۆ لای ئافرەتەکە و مناڵەکانی گەڕایەوە و بەدەستی خۆی چێشتی بۆ مناڵەکان ئامادە کرد و تێری کردن.

دایکی مناڵەکان کەئەمەی دیت ووتی: بەیەزدانی گەورە تۆ لەعومەری کوڕی خەتتاب باشتری بۆ خەلیفایەتی، ئیمامی عومەریش ووتی: دەکەواتە خوشکی ئیسلامم بەیانی وەرە بۆ لای عومەر و منیش لەوێ دەبم، تاکو چارەیەکی ئەو هەژارییەت بکا.

بۆ بەیانی ئافرەتەکە هاتە ماڵی خەلیفە و دیتی لەنێوان عەلی کوڕی ئەبوتالیب و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود کابرایەك دانیشتووە و هەردوکیشیان بە (أمير المومنين) ناوی دەبەن، کابراش هەمان کابرای دوێنێ شەوە.

کەئافرەتەکە بۆی دەرکەوت ئەو کابرایەی دوێنێ شەو قسەی لەگەڵ کردبوو ئیمامی عومەر بوو نەختێك ترسا، بەڵام ئیمامی عومەر دڵی دایەوە و ووتی هیچ نەبووە، ئەویش داوای لێبوردنی لەئیمامی عومەر کرد.

## ١١- خۆشەویستی راستەقینە

جارێك ئیمامی عەلی و ئیمامی ئەبوبەکر بۆ سەردانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چوون، کەگەیشتنە بەر دەرگای ماڵەکەی، ئیمامی ئەبوبەکر بەئیمامی عەلی ووت: فەرموو پێشکەوە.

ئیمامی عەلی ووتی: ئەبوبەکر من چۆن بەپێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی لەدوای پێغەمبەرەکان کەس لەئەبوبەکر باشتر نییە.

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی: ئەدی من چۆن بەپێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: کەفاتیمەم لەعەلی مارە کرد باشترین زاتم دایە باشترین پیاو.

ئیمامی عەلی ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: ئەگەر هەموو ئوممەتم لەگەڵ ئیمانی ئەبوبەکر بەتەرازوێك بەراورد بکرێ هێشتا ئیمانی ئەبوبەکر گرانتر دەبێ.

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: لەرۆژی قیامەت عەلی کوڕی ئەبوتالیب لەگەڵ فاتیمە و حەسەن و حوسێن پێکەوە لەمەیدانی مەحشەر هەریەکەیان بەخۆو

بەسورایێك پێکەوە دەوەستن، خەڵکی دەڵێن: ئەرێ ئەوە کام پێغەمبەرە؟!
وەڵامیان دەدرێتەوە: ئەوە پێغەمبەر نییە، ئەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیبە.

ئیمامی عەلی ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: ئەگەر جگە لەخوای گەورە خۆشەویستێکم هەڵبژاردایە ئەوا ئەبوبەکرم هەڵدەبژارد.

ئیمامی ئەبوبەکر ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا پێغەمبەری خوا لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: لەرۆژی قیامەت من و عەلی پێکەوەین و خوای گەورەش دەفەرمووێ: ئەی خۆشەویستم من (إبراهیم)م بەباشترین کوڕ بۆ تۆ هەڵبژارد و عەلیش بەباشترین برا و برادەر.

ئیمامی عەلی ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا خوای گەورە لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: ﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾ الزمر: ٣٣ .

ئیممای ئەبوبەکر ووتی: ئەدی من چۆن پێش تۆ بکەوم لەکاتێکا خوای گەورە لەبارەی تۆوە فەرموویەتی: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يَشْرِي نَفْسَهُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَاللَّهُ رَءُوفٌ بِالْعِبَادِ ﴿٢٠٧﴾ ﴾ البقرة: ٢٠٧.

لەوکاتەی ئەوان لەو گفتوگۆیەدا بوون، حەزرەتی جبرائیل هاتە لای پێغەمبەر و پێی ووت: وا ئەبوبەکر لەگەڵ عەلی لەبەردەرگای ماڵەکەت راوەستاون و هەستە بۆ لایان، پێغەمبەریش هاتە لایان و هەر دەستێکی خستە سەر شانی یەکێکیان و پێکەوا بردنیە ژوورێ و فەرمووی: لەرۆژی قیامەت بەم شێوەیە حەشر دەکرێین.

## ١٢- خۆڕاگرتن

خەلیفەی موسڵمانان (ئیمامی عومەر) جارێك داوای لەخەبابی كوڕی ئەرەث كرد كەناخۆشترین ئازار و سزای كافرەكانی مەككەی بۆ بگێڕێتەوە، خەبابیش شەرمی دەكرد وەڵامی بداتەوە چونكە گێڕانەوەی ئازاردانەكەی بەخۆهەڵكێشان تێ دەگەیشت، بەڵام خەلیفە وازی لێ نەدەهێنا و چەند جارێ داواكەی دووبارە كردەوە و خەببابی ناچار كرد.

خەبابیش هەستا كراسەكەی بەری داكەند و پشتی خۆی رووت كردەوە، كەعومەر چاوی بەپشتی كەوت، چاوی هێناوە یەك و پرسی ئەمە چۆن وای لێ هاتووە؟

خەبباب ووتی: جارێكیان بت پەرستانی مەككە ئاگرێكی گەورەیان كردەوە و ماوەیەك وازیان لێ هێنا تا ئاگرەكە دامركایەوە و بوو بەخەڵووزێكی گەش، ئینجا جلەكانیان داكەندم و لەسەر پشت لەسەر ئاگرەكە رایان كێشام هەتا گۆشتی پشتم لەئێسقانەكانی جیا بۆوە و كەوتە خوارەوە، ئینجا ئەوەندە ئاو و چەوری لەلەشم هاتە خوارەوە بەشێوەیەك ئاگرەكەی كوژاندەوە.

# ١٣- گوێم لێ نییە

پاش مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرکردەی چەند هۆزێك لەهۆزەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی لەدین وەرگەڕان و خەڵکێکی زۆریشیان بەگەل کەوت، ئەو سەرکردانە هەر بەوەندەش رانەوەستان، بەڵکو هەندێکیان دەیانووت ئێمە بووینە پێغەمبەر.

ئیمامی ئەبوبەکریش کەپاش مردنی پێغەمبەر بووە خەلیفەی موسڵمانان هەستا سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە و ناردییە سەر ئەو هەڵگەڕاوانە.

موسەیلەمەی درۆزنیش یەکێك بوو لەسەرکردەی ئەو هەڵگەڕاوانە و خۆی کردبووە پێغەمبەر.

لەشەڕی یەمامە موسیلەمە (حەبیبی کوڕی زەید)ی بەدیل گرت و خستییە ژێر تەعزیب، ناخۆشترین تەعزیبیان دەدا، موسیلەمە لەکاتی تەعزیبدان بەگاڵتە پێ کردن لەحەبیبی دەپرسی: شاهیدی دەدەی کەموحەممەد پێغەمبەری خوایە؟ ئەویش دەیووت: بەڵێ شاهیدی دەدەم کەموحەممەد پێغەمبەری خوایە، پاشان لێی دەپرسی: شاهیدی دەدەی کەمن پێغەمبەری خوام؟ حەبیب دەیووت: گوێم لێ نییە.. چی دەڵێی؟!

کەحەبیب وای دەوت موسیلەمە زیاتر لێی توڕە دەبوو زیاتر ئازاری دەدا، هەتا وای لێ هات پارچە پارچە گۆشتی لەلەشی حەبیب دەکردەوە، بەڵام حەبیب هیچ لەسەر قسەی خۆی نەهاتە خوارەوە و کەناوی پێغەمبەریان دەهێنا دەیووت هەقە، وەکەناوی موسیلەمەیان دەهێنا دەیووت گوێم لێ نییە دەڵێن چی، ئەوانیش زیاتر ئازاریان دەدا تا لەبەر دەستیان شەهید بوو، بەراستی حەبیب و وێنەی حەبیب نموونەی موسڵمانانی خۆگر و پاڵەوان و چاونەترس دەنوێنن.

## جەنگی موئتە

جەنگی موئتە لەو جەنگانەیە کەلەسەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەنێوان هێزی ئیسلام و هێزی کوفر ڕووی دا، بەڵام ئەم جەنگە لەگەڵ جەنگەکانی تر لەچەند ڕوویکەوە جیاوازە.

ئەوەبوو پاش هەشت ساڵ تێپەڕبوون بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی پێشەوامان محمد (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرمان سوپایەکی سێ هەزار کەسی ڕێکخست بۆ ئەوەی بەرەو وڵاتی شام بچێ، پێغەمبەر زەیدی کوڕی حاریسەی کردە سەرکردەی سوپایەکە و ئاڵایەکی سپیشی دایە دەست و فەرمووی: ئەگەر زەید شتێکی بەسەرهات ئەوا با جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ببێتە سەرکردەتان، وەئەگەر جەعفەر شتێکی لێ بەسەرهات ئەوا عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە، ئەگەر عەبدوڵڵاش شتێکی بەسەرهات ئەوا لەنێوان خۆتان یەکێك هەڵبژێرن بەم شێوەیە سوپایەکە بەڕێ کرا.

ئەم جەنگی موئتەیە زۆر نموونەی پاڵەوانێتی و گیان فیداکاری بۆ ئاینی ئیسلام تیا بوو، ئەو جەنگە زۆر پاڵەوانی ئاشکرا کرد.. ئەو جەنگە سەلماندی کەئەوەی بەباشی لەو ئاینە بگات ئامادە دەبێ خۆی لەپێناویدا فیدا بکات، وا لەلاپەڕەکانی داهاتوودا بەیارمەتی خوای گەورە هەندێك وێنەی پاڵەوانێتی ئەو جەنگە دەخەینە بەرچاو.

## ١٤- ترسانی کوفر لەئیسلام

کابرایەك لەشاری مەدینە هەبوو سیخوڕ (جاسوس)ی رۆمەکان بوو لەدورگەی عەرەبی، هێشتا سوپای ئیسلام دەرنەچووبوو کەئەو کابرایە هەواڵی بۆ رۆمەکان نارد کەگوایە هێزێکی ئاوا و ئاوا بەرەو شام دێت.

کەرۆمەکان زانیان هێزی ئیسلام بەرەو ئەوان دێت ترسیان لێ نیشت، بۆیە هەستان سوپایەکی سەد هەزار کەسییان بەسەرکردایەتی تیۆدۆری برای هەرقەلی پادشای رۆمەکان لەشام ئامادە کرد، هۆزە عەرەبە گاورەکانیش خۆیان کۆکردەوە و ئەوانیش لەشکرێکی سەد هەزار تریان پێك هێنا بۆ ئەوەی پشتگیری رۆمەکان بکەن، بەم شێوەیە لەشکری هەردوولای دوژمن بوو بەدوو سەد هەزار سەرباز.

ئەو کارەی رۆمەکان کەئەو لەشکرە گەورەیان بۆ ئەو لەشکرە بچووکە کۆکردەوە زۆر بەجوانی دەیسەلمێنێ کەسام و هەیبەتی موسڵمانەکانی تا چ رادەیەك لەدڵی کافرەکانی جێی خۆی کردۆتەوە، سام و هەیبەتی هەموو لەشکرێکی قورئانیش لەناو دڵی هەموو لەشکرێکی کوفر لەهەمووکات و زەمانێك هەیە و هەر دەمێنێ.

## ١٥- یان سەرکەوتن یان شەهیدی

کەلەشکری قورئان گەیشتە شام و پێی زانی لەشکرێکی ئاوا گەورە چاوەڕوانی دەکات، لەم پرسیارەیان هاتە پێش: ئایا ئەو لەشکرە بچووکە دەتوانێت بەرەنگاری لەشکرێکی ئاوا گەورە بێت؟

زەیدی سەرکردە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە ڕای موسڵمانەکانی وەرگرت، لەئەنجامدا هەندێکیان وتیان: با نامەیەك بۆ پێغەمبەر بنێرین بزانین ئەو ئەمری بەچی دەکا، هەندێکی تریشیان ڕایان وابوو بەگژ دوژمن دا بچن.

عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە کەجێگری جێگری سەرکردەی لەشکری موسڵمانەکان بوو موسڵمانەکانی هان دەدا تا بەرەنگاری دوژمن بن و دەیوت: ئێمە خۆمان بۆ شەهیدبوون هاتووینە دەرەوە، ئەی کەواتە لەچی بترسین.

لەئەنجامدا موسڵمانەکان خۆیان لەدوژمن بەبەهێزتر زانی و قسەیان بوو بەیەك و هەموویان بڕیاریان دا یان سەرکەوتن یان شەهیدی.. یان سەرکەوتن یان شەهیدی.. یان سەرکەوتن یان شەهیدی.

# ١٦- ئاڵای ئیسلام ناڕوخێ

بەڵێ موسڵمانەکان بڕیاریان دا بەگژ دوژمن دا بچن، یان سەردەکەون یان شەهید دەبن، شەڕ لەنێوان لەشکری قورئان و لەشکری کوفر گەرم بوو، موسڵمانەکان وەك شێری برسی پەلاماری ڕۆمەکان و لایەنگرەکانیان دەدا، لەپشت هەمووشیان زەیدی کوڕی حاریسەی سەرکردە کەئاڵای لەشکرەکەی هەڵگرتبوو.

ڕۆمەکان بۆ ئەوەی وورەی (مەعنەوییات)ی موسڵمانەکان دابەزێنن دەیانویست ئاڵای لەشکرەکەیان بەریدەنەوە، بۆ ئەو مەبەستە لەهەموولایەك زەیدی کوڕی حاریسەیان ڕم و تیر باران کرد و هەموو لەشی کون کون بوو و شەهید کرا، بەڵام ئاڵای ئیسلام نەکەوت، جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب بەرزی کردەوە.

یەکێك لەڕۆمەکان شیرێکی لەدەستی ڕاستی جەعفەر دا و پەڕاندی، بەڵام جەعفەر لەو کەسانە نەبوو کەبهێڵێت ئاوا بەئاسانی ئاڵای ئیسلام بڕوخێ، بەدەستەکەی تر ئاڵایەکەی بەرز کردەوە، بەڵام ڕۆمێك دەستەکەی تریشی پەڕاند، لەگەڵ ئەوەشدا جەعفەر هەر نەرووخا و ئەوجارە بەباسکەکانی ئاڵایەکی هەڵگرت، بەڵام بەداخەوە ناپیاوێك لەپشتەوە ڕمێکی لێ دا و شەهیدی کرد.

لەپاش جەعفەر عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە ئاڵاکەی هەڵگرت و زۆر مەردانە شەڕی کرد، بەڵام ڕۆمەکان ئەویشیان شەهید کرد، بەم شێوە مەردانەیە هەرسێ سەرکردەکان شەهید کران، ئینجا موسڵمانەکان خالیدی کوڕی وەلیدیان بەسەرکردە هەڵبژارد، خالید بەپیلانێکی سەربازی زیرەکانە توانی لەشکرەکە لەگەمارۆی لەشکرە گەورەکەی ڕۆمەکان ڕزگار بکات و لەشکرەکە بگەڕێنێتەوە.

ئەگەر خوای گەورە یارمەتی بەندە ئیماندارەکانی خۆی بدات ئاوایە، ئەو لەشکرە گەورە و بەهێزە نەیتوانی لەشکری موسڵمانەکان لەناو ببات، لەکاتێکا دەبوایە هەر سەربازێکی موسڵمان بەرامبەر زیاتر لە (٦٥) سەربازی رۆمی رابوەستێ و شەڕیان لەگەڵ بکات.

جگە لەوەش رۆمەکان پەنجا هەزار کەسیان ئەسپ سوار بوون و سەد و پەنجا هەزارەکەی تریشیان هەموویان زرێ پۆش بوون و هەموویان کڵاوی ئاسنیان لەسەر بوو، وەسوپای رۆمەکان لەو زەماندا گەورەترین و بەتواناترین و بەهێزترین سوپای جیهان بوو.

## ١٧- دادوەری ئیسلام

جارێکیان ئیمامی عەلی (رضي الله عنه) لەبازاڕ دەگەڕا، دیتی وا جوولەکەیەك زرێیەکەی ئەوی بەدەستەوەیە، ئیمامی عەلی زرێیەکەی خۆی ناسییەوە، بەڵام جوولەکەکە نەیسەلماند و گوتی هی خۆمە.. قسەیەك لەو قسەیەك لەوی تر هەستان چوونە لای قازی موسڵمانان.

ئیمامی عەلی بەقازی ووت: ئەو زرێیە هی منە و جارێك لەسەر پشتی ووشترەکەم لێم کەوتووە و ئەو کابرایە هەڵی گرتۆتەوە و ئێستاش دەڵێ هی منە، جوولەکەکەش ووتی: زرێ زرێی خۆمە و لەلای خۆشمە.

قازی ووتی: ئەمیری موسڵمانان بەیەزدانی گەورە من دەزانم راست دەکەی ئەو زرێیە هی تۆیە، بەڵام هەر دەبێت دوو شاهیدم بۆ بهێنی، ئیمامی عەلیش هەستا دوو شاهێدی هێنا کەیەکێکیان حەسەنی کوڕی بوو.

قازی بەعەلی ووت: شەهادەی کوڕەکەت وەرناگرین، ئیمامی عەلی پێی ووت: چۆن.. ئەدی لەعومەری کوڕی خەتتابت نەبیستووە کەووتویەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: حەسەن و حوسێن گەورەی گەنجەکانی بەهەشتن؟! قازی ووتی بیستوومە پاشان بەجوولەکەکەی ووت زرێیەکە ببە.

جوولەکەکە زرێیەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، کەئاوڕی دایەوە دیتی وا ئیمامی عەلی لەگەڵ قازی دەستیان لەملی یەکتری کردووە، زۆری پێ سەیر بوو و لەدڵی خۆی ووتی: ئەمیری موسڵمانان لەگەڵ من دێتە لای قازی و پاشان قازی حوکمی دەکات و بەحوکمەکەش ڕازی دەبێت، ئەوجا لەسەر ئەو حاڵەش هێشتا دەستی لەملی دەکات، بەڕاستی سەیرە!!

جوولەکەکە گەڕایەوە لایان و ووتی: قەسەم بەخوا ئەمیری موسڵمانان ئەو زرێیە زرێی تۆیە و لەسەر ووشترەکەت لێت کەوت و من هەڵم گرتەوە، پاش ئەو قسانەش بووە موسڵمان.

ئیمامی عەلی ووتی: چونکە بوویتە موسڵمان با زرێیەکە بۆ تۆ بێ و ئەسپەکەی خۆمیشت هەر پێشکەش دەکەم، شایانی باسە ئەو کابرایە هەر لەگەڵ ئیمامی عەلی مایەوە هەتا لەجەنگی صوفەین شەهید کرا.

## ١٨- دەیفرۆشمە خوا و پێغەمبەر

ئیمامی عوسمان (رضی الله عنه) خواردن و خۆراکێکی زۆری کڕیبوو، کەگەیشتەوە مەدینە بازرگانەکان دەورەیان لێ دا و دوو ئەوەندەی نرخەکەی پارەیان دایێ تاکو پێیان بفرۆشێ، بەڵام ئیمام عوسمان نەیفرۆشت و ووتی: زیاتریان داوە.

بازرگانەکان ووتیان دەباشە پێنج ئەوەندەی نرخەکەت دەدەینێ؟ ئیمامی عوسمان ووتی: یەکێك بە دە (١٠) ئەوەندەی نرخەکەی لێم دەکڕێ، بازرگانەکان زۆریان پێ سەیر بوو، ووتیان: باشە خۆ لەو شارە لەئێمە زیاتر هیچ بازرگانی تر نییە، ئەوە کێیە بە دە قیمەت لێت دەکڕێ؟! ئیمامی عوسمان ووتی: خوا و پێغەمبەر بە دە قیمەت لێمی دەکڕن.

## ١٩- خەلیفە و پارەی موسڵمانان

کاتێك ئیمامی عەلی بووە خەلیفە، عەقیلی برای هاتە لای پێت ووت: ئەی عەلی ئەوە بوویە ئەمیری موسڵمانان، دەمەوێ هەندێك پارەم بدەیتێ، ئیمامی عەلیش پێی ووت: دەباشە کەئێوارە داهات وەرە.

بۆیە ئێوارە ئیمامی عەلی پارچە ئاسنێکی گەرم کرد و خستییە ناو توورەگەیەك، کەعەقیل هات ووتی: عەلی پارەکەت بۆ ئامادە کردوم؟ ئیمامی عەلیش ووتی: بەڵێ وا لەناو ئەو توورەگەیە، هەر کە عەقیل دەستی بۆ توورەگەکە برد، دەستی سووتا و دڵی لەخۆ بۆوە و کەوت.

کەبەخۆ هاتەوە ئیمامی عەلی پێی ووت: عەقیل تۆ ئەگەر بەرگەی ئەو ئاگرە نەگری ئەدی چۆن بەرگەی ئاگرەکەی دۆزەخ دەگری؟ ئەگەر بەو ئاگرە بچووکە ئەمە حاڵت بێ، ئەی دەبێ حاڵی من و تۆ چۆن بێ ئەگەر لەناو ئاگری دۆزەخ زنجیر کراین؟! برام ئەوەی لەگەڵ پارەی موسڵمانان دەست پاك نەبێ، لەڕۆژی قیامەت پردێکی بۆ دادەنرێ کەلەسەری ڕادەوەستێ لەژێر پێی دا دەڕووخێ و دەکەوێتە ناو دۆزەخ و حەفتا ساڵ تیای دەمێنێتەوە.

## ٢٠- من سەرکەوتم!

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کۆمەڵە سەحابەیەکی بۆ ناوچەی نەجد نارد تاکو خەڵکی ئەو ناوچەیە بۆ ئاینی ئیسلام بانگ بکەن، ژمارەی ئەو سەحابانەش چل کەس دەبوون.

کەگەیشتنە ناوچەکە سێ هۆز لەهۆزەکانی بەنی سەلیم کەکافر بوون چواردەورەیان دان، بەڵام موسڵمانەکان پێیان شەرم بوو چەکیان فڕێ بدەن و بەگژیان دا چوون، هەتا یەکە یەکە هەموویان شەهید کران، تەنها کەعبی کوڕی زەیدیان بەزیندوویی مایەوە، بەڵام ئەویش هەر ئەوەتە مابوو و نەمابوو، هەروەها دووی تریش کەئەوان لەپشتەوە لەدووری کۆمەڵەکە دەڕۆیشتن، ئەو دووەش مابوون.

ئەو دووەش کەدیتیان وا تەیر و توار بەسەر شوێنی کۆمەڵەکە دەسوورێنەوە، زانیان شتێك روویداوە، کەچوونە پێش دیتیان هەموویان کوژراون، یەکێکیان ووتی با بگەڕێینەوە و خەبەری پێغەمبەر بدەین، بەڵام ئەوەی تریان کەمونزیری کوڕی موحەممەد بوو ووتی: من خۆم چاوەڕوانی ئەو رۆژەم دەکرد، ئێستا چۆن دەگەڕێمەوە ئینجا خۆی گەیاندە کافرەکان و شەڕی کرد هەتا شەهید کرا.

جەبباری کوڕی سەلماش یەکێك بوو لەوانەی کەبەسەر موسڵمانەکانیان دادا، ئەو جەببارە دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەوەی پاڵی بەمنەوە نا کەببمە موسڵمان ئەوەبوو لەو رۆژەی لەکاتی شەڕەکە هەتا هێز و توانام هەبوو رمێکم لەپشتی یەکێك لەموسڵمانەکان دا، رمەکە لەسینگی هاتە دەرەوە، منیش ویستم تەماشای سەری رمەکەم بکەم گوێم لێ بوو کابرا ووتی: وەڵڵاهی سەرکەوتم

(بردمەوە)، منیش لەدڵی خۆم ووتم: باشە من وا کابرام کوشت، ئەدی چی بردەوە؟!

جەببار دەڵێ: پاشان پرسیم کەئەو کابرایە چی بردەوە ووتیان: شەهیدی، ئەوجا ووتم: وەڵڵاهی ڕاستی کرد سەرکەوت و بردییەوە.

## ٢١- پێغەمبەری خوا شەهیدم؟

پێش دەست پێ کردنی جەنگی بەدر سێ کەس لەکافرەکان هاتنە دەرەوە و داوای هاوسەریان کرد، پێغەمبەریش فەرمووی: حەمزە، عەلی، ئەبو عوبەیدە.. بۆیان دەرچن.

ئیمامی حەمزە و ئیمامی عەلی هەر زوو یەکە و یەکیان کوشت، ئەبوو عوبەیدەش یەکێکی کوشت، بەڵام خۆشی شیرێکی وای بەرکەوت کەئێسکی ڕانی لەت کرد.

کەهێنایانە لای پێغەمبەر، لەپێغەمبەری پرسی: پێغەمبەری خوا شەهیدم؟ پێغەمبەر فەرمووی بەڵێ شەهیدی، ئینجا ئەبو عوبەیدە چاوەکانی داخست و شەهید بوو.

## کاروانی شەهیدان

کۆمەڵە خەڵکێك هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ووتیان: ووڵاتی ئێمە موسڵمانی تیایە، بەڵام لەئاین زۆر شارەزا نین و دەمانەوێت هەندێك موسڵمانی شارەزامان لەگەڵ بنێری تاکو فێری ئاین و شەریعەتی ئیسلاممان

بکەن و لەقورئانی پیرۆز شارەزامان بکەن، پێغەمبەریش شەش صەحابەی لەگەڵ ناردن کەئەمانە بوون:

١- مەرثەدی کوڕی مەرثەد. ٢- خالیدی کوڕی بوکەیر. ٣- عاصمی کوڕی ثابت. ٤- خوبەبیکی کوڕی عەددەی. ٥- زەیدی کوڕە دەثەنە. ٦- عەبدوڵڵای کوڕی تاریق.

شایانی باسە پێغەمبەر مەرثەدی کردە سەرکردەیان.

گەشتی ئەو تیپە مامۆستایە زۆر رووداو و بەسەرهاتی لەوانە و دڵ تەزێنی تیادایە کەوا هەندێکیان باس دەکەین.

## ٢٢- خوا پەرستی

کەتیپەکە لەگەڵ میوانەکان لەشاری مەدینە دەرچوون و دوور کەوتنەوە، ئەوانەی لەگەڵ خۆیان دەبردن (میوانەکان) شمشێریان دەرهێنا و چواردەورەیان گرتن، ئەو کەسانە خۆیان کافر بوون و بەفێڵ هاتبوون تاکو چەند کەسێك بگرن، یەکەم جار بەمامۆستایەکانیان ووت: دەستتان مەکەنەوە شەرت بێ هیچتان لێ ناکەین تەنها دەتانبەینە مەککە و لەوێ دەتانفرۆشین، بەڵام مامۆستایەکان رازی نەبوون بەوەی خۆیان بدەنە بەردەستیان بۆیە شمشێریان دەرهێنا و کردیانە شەڕ، بەڵام لەبەرئەوەی کافرەکان زۆر بوون توانیان مەرثەد و خالید و عاصمیان لێ شەهید بکەن.

کافرەکان کەعاصمیان شەهید کرد ویستیان سەری ببڕن بۆ ئەوەی لەمەککە بیفرۆشنە (سولافەی کچی سەعد)، چونکە ئەو سولافەیە شەرتی کردبوو کەئەگەر

سەری عاصمی بەدەست بکەوێ دەبی ئارەقی تیا بخواتەوە، ئەوەش چونکە عاصم کاتی خۆی لەجەنگی ئوحد هەردوو کوڕی سولافەی کوشتبوو.

بەڵام کەهاتن سەری ببڕن، خوای گەورە رەوە زەنگەزۆرەیەکی نارد کەوایان لەکافرەکان کرد نەوێرن لەلاشەکەی عاصم بچنە پێش و بەناچاری لێی گەڕان ووتیان شەوێ ئەو زەنگەزۆرانە دەڕۆن ئینجا سەری دەبڕین.

کەشەو داهات خوای گەورە لافاوێکی بەناو دۆڵەکە نارد لاشەکەی عاصمی لەگەڵ خۆی برد و بۆ بەیانی چەند لێی گەڕان نەیاندۆزییەوە، شایانی باس کردنە (عاصم خوا لێی رازی بێ) کەبووە موسڵمان پەیمانی بەخوای گەورەدا کەهەتا دەمرێ نابێ لەشی بەلەشی کافر بکەوێ.

عومەری کوڕی خەتتابیش لەبارەی عاصمەوە دەڵێ: خوای گەورە بەندە ئیماندارەکانی خۆی دەپارێزێ.. عاصم بەڵێنی دابوو هەتا لەژیاندا بمێنێ خۆی لەکافرەکان بپارێزێ، بەڵام خوای گەورە پاش مردنیش هەر پاراستی.

## ٢٣- خۆشەویستی پێغەمبەر

پاش شەهید کردنی مەرثەد و خالید و عاصم، کافرەکان توانیان کەخوبەیب و زەید و عەبدوڵلاش بەدیل بگرن و هەرسێکیان قۆڵبەست کردن تا بۆ شاری مەککەیان ببەن، لەرێگا عەبدوڵلا دەستی خۆی کردەوە، بەڵام کافرەکان زۆر بەبێ ویژدانی هەر بەبەردباران کردن کوشتیان، هەرچی خوبەیب و زەیدیش بوون بۆ شاری مەککەیان بردن.

لەمەککە صەفوانی کوڕی ئومەییە زەیدی کڕی تاکو لەتۆڵەی باوکی بیکوژێتەوە، چونکە موسڵمانەکان لەجەنگی بەدردا باوکیان کوشتبوو.

یەکێك لەوانەی ئامادەی کوشتنی زەید بوون ئەبو سوفیان بوو، ئەبو سوفیان لەناو خەڵکەکە هاتە دەرەوە و لەزەید نزیك بۆوە و لێی پرسی: لەبەر خاتری ئەو خوایە زەید ئەگەر بەراستی پێم نەڵێی کامت پێ خۆشتر بوو: لەسەری تۆ بدەین یان موحەممەد لەجێگەی تۆ بایە و تۆش لەناو ماڵ و منداڵی خۆت بوای؟

خوێنەران دڵنیا بن ئێستا ئەبو سوفیان لەدڵی خۆی وای داناوە کەزەید بڵێ: خۆزگە موحەممەد لەجێگەی من بوایە بەڵام من وام بەسەر نەهاتبایە.

بەڵام ئەبو سوفیان بەسەهوو چوو بوو، چونکە هی وەکو زەید تەنانەت بەزاریش ئەو قسەیە ناکەن، بەڵکو وتی: وەڵڵا ئەو کوشتنەم پێ خۆشترە لەوەی کەپێغەمبەر تەنها دڕکێکی بچێتە قاچی، ئەبو سوفیان ووتی: لەناو خەڵك کەسم نەدیت ئەوەندە یەکتریان خۆش بوێ هەندەی ئەوەی کەهاوڕێیەکانی موحەممەد موحەممەدیان خۆش دەوێ، پاشان زەیدیان شەهید کرد.

## ٢٤- لەمردن ناترسم

هەرچی خوبەیب بوو، ئەویش حەجیری کوڕی ئەبی ئەهاب کڕی تاکو لەتۆڵەی برایەکەی بیکوژێ. کافرەکان کەبردیان بیکوژن، خوبەیب پێی ووتن: ئایا ڕێگەم دەدەن پێش ئەوەی بمرم دوو رکاعەت نوێژ بکەم؟ ئەوانیش ڕێگەیان دا.

کەخوبەیب لەنوێژەکەی بۆوە پێی ووتن: وا مەزانن لەمردن دەترسم چونکە نوێژەکەم نەختێك درێژ بوو، ئینجا ئەو شیعرەی خوێندەوە:

گوێم لێ نییە گەر بێت و بەموسڵمانی بکوژرێم

لەسەر هەر لاتەنیشتێك بێ لەپێناوی خوایە رێم

پاشان خوبەیبیان لەخاچ گرت و کوشتیان و گیانە پاکەکەی بەشەهیدی گەیشتە گیانی پێنج برایەکەی تری تاکو ببنە میوانی یەزدانی گەورە.
بەم شێوەیە هەر شەش مامۆستاکە لەپێناوی خوا سەریان ناوە و کەسیان لەگەشتەکە نەگەڕاوە.

## ٢٥- موسڵمان بوونی ئیمامی عەلی

ئیمامی عەلی کەتەمەنی هەشت ساڵ بوو، رۆژێك لەناکاو چووەماڵەوە دیتی وا پێغەمبەر و خەدیجەی خێزانی نوێژ دەکەن، کەلەنوێژەکە بوونەوە عەلی لێی پرسین: ئەوە سوجدەتان بۆ کێ دەبرد؟ پێغەمبەر فەرمووی: سوجدەمان بۆ ئەو تاك و تەنیایە دەبرد کەمنی دروست کردووە بەپێغەمبەر و ئەمری پێ کردووم کەخەڵکی بۆ ئاینی ئیسلام بانگ بکەم، ئینجا داوای لەعەلی کرد بێتە سەر ئەو ئاینە و ببێتە موسڵمان.
عەلی لەوەڵامدا ووتی: مۆڵەتم بدە تا مەسەلەکە لەگەڵ ئەبو تالیبی باوکم باس بکەم، پێغەمبەر فەرمووی: قەیناکە خۆت بیری لێ بکەوە بەڵام لەلای کەس باسی مەکە.
بۆ بەیانی ئیمامی عەلی هاتە لای پێغەمبەر پێی ووت: خوای گەورە کەمنی دروست کرد پرسی بەئەبو تالیب نەکرد، منیش ئەگەر خوای خۆم بپەرستم پێویست ناکا پرس بەئەبو تالیب بکەم، ئینجا بووە موسڵمان.

# ٢٦- بیلالی خۆگر

لەسەرەتای سەرهەڵدان ئاینی ئیسلام وەها ئاسان نەبوو کەهەریەکێك بەکەیفی خۆی بێتە رێگەی ئەو ئاینە نوێیە، بەڵکو تووشی جۆرەها تەعزیب و ئازاردان دەهاتن.

بیلالی حەبەشیش یەکێك بوو لەوانەی کەتووشی ئازاردان بوو، بیلال بەندەی ئومەییەی کوڕی خەلەف بوو، کاتێ ئومەییە زانی بیلال بویتە موسڵمان هەوڵی دا پەشیمانی بکاتەوە، بەڵام بێ سوود بوو، ئینجا کەوتە ئازاردانی، بەجۆرێ ئەچوو پەتی ئەخستە ملی و ئەیدایە دەست منالآن، هەتا رایکێشن و پەتی پەتی بکەن، ئەویش هەر ئەیووت: أحدٌ... أحدٌ، واتە خوا هەریەکە و نابێ بەدوو، هەروەها لەکاتی گەرمای هاوین بیلالی دەهێنا و لەناو ئەو لمە گەرمەی مەککەدا ئەیخستە سەر پشت و بەردی گەورەی ئەخستە سەر سنگی و پێی دەووت: دەبێ هەر ئەوە حاڵت بێ هەتا لەسەر ئەو دینەی موحەممەد مابی، بیلالیش هەر دەیووت: أحدٌ... أحدٌ، بەو چەشنە مایەوە تا رۆژێك ئەبوبەکر بەوێدا تێپەڕی و ئەو دیمەنە ترسناکەی دیت.

ئیمامی ئەبوبەکر بەئومەییەی ووت: ئەوە لەخوا ناترسی؟ کوڕە هەتا کەی ئەو داماوە ئازار دەدەی؟ ئومەییە ووتی: تۆ خراپت کردووە، دەتۆش رزگاری بکە، ئینجا ئەبوبەکر بیلالی لێ کڕی و رزگاری کرد.

## ٢٧- دەمەوێ شەهید بم

کەموسڵمانەکان بۆ جەنگی بەدر دەردەچوون، منداڵێك بەناوی عومەیری کوڕی وەققاص بوو لەماڵ هاتە دەرەوە بەو نیازەی کەئەویش لەگەڵیان بچێتە جەنگ، عومەیر تەمەنی هەر (١٦) ساڵ دەبوو.

عومەیر زۆر دوو دڵ و ناڕەحەت بوو، برایەکەی (سەعید) لێی پرسی: ها برام ئەوە بۆ وەها دڵ تەنگی؟ عومەیر ووتی: دەترسم پێغەمبەری خوا لێم نەگەڕێ بچم، منیش زۆرم پێ خۆشە لەگەڵیان دەربچم بەڵکو خوای گەورە شەهیدیم پێ ببەخشێ هەروەهاش ڕوویدا، ئەوەبوو یەکەم جار پێغەمبەر ویستی بیگەڕێنێتەوە بەڵام عومەیر گریا ئەوجا پێغەمبەر ڕێگەی پێ دا لەگەڵیان دەربچێ و لەجەنگەکەشدا بەشەهیدی کوژرا.

## ٢٨- خوا ڕزگارم دەکات

لەجەنگی خەطفان پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەژێر دارێك بۆ حەسانەوە دانیشتبوو، کابرایەکیش کەناوی دەعثور بوو هات شمشێری لەسەر سەری پێغەمبەر دانا و ووتی ئەی موحەممەد کێ لەژێر دەستم ڕزگارت دەکات؟ پێغەمبەریش تەماشایەکی کرد و زۆر بەسام و هەیبەت ووتی: الله، دەعثور لەترسان شمشێری لەدەست کەوتە خوارەوە، پێغەمبەریش شمشێرەکەی هەڵگرتەوە و فەرمووی: ئەدی کێ تۆ قوتار دەکات؟

دەعثور ووتی: کەس، پێغەمبەریش لێی خۆش بوو نەیکوشت، دەعثور لەبەر ئەو هەڵوێستەی پێغەمبەر موسڵمان بوو داواشی لەقەومەکەی خۆی کرد ئەوانیش ببنە موسڵمان.

شایانی باسە دەعثوور سەرکردەی قەومەکەی بوو و نیازی ئەوەی هەبوو کەبەسەر شاری مەدینە دابدات، هەر لەبەر ئەوەش بوو پێغەمبەر بەخۆی و ٤٠٠ کەس هاتبوون بەسەریان دابدەن، بەم شێوەیە ئەو کابرایە لەدوژمن گۆڕا بۆ دۆست و برا، ئەوەش لەبەر ئەو هەڵوێستە جوانەی پێغەمبەر.

## ٢٩- موسڵمان ناترسێ

پاش ئەوەی کافرەکان رۆژ بەرۆژ زیاتر ئازار و ئەشکەنجەی موسڵمانەکانیان دەدا، ئیتر یەك یەك و دوو دوو بەنهێنی بۆ شاری مەدینە کۆچیان دەکرد، بۆیەش بەنهێنی کۆچیان دەکرد نەوەك کافرەکان بیانکوژن و نەهێڵن کۆچ بکەن، چونکە ئەوان دەیانزانی کەئەگەر ئەوانە لەشاری مەککە بچنە دەرەوە ئیتر ئاینی ئیسلام لەهەموو لایەك بڵاو دەبێتەوە، بۆیە دەیانویست موسڵمانەکان هەر لەژێر رکێفی خۆیان بن.

بەڵام ئاینی ئیسلام پیاوی چاونەترس و ئازاش دروست دەکات، ئەوەبوو کەئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ویستی کۆچ بکات شمشێری کردنە شانی و خۆی بەتەواوی چەکدار کرد، ئەوجا هاتە لای کەعبە، لەوکاتەشدا یانەی قورەیشییەکان پڕ بوو لەپیاو، لەپێش چاوی هەموویان حەوت جار لەچواردەوری کەعبە سووڕایەوە و پاشان هاتە لای قورەیشییەکان و ووتی: بەخوا دەم و چاوی ناشیرینن، هەی خوا لوتتان لەخۆڵ بباتە خوارەوە، ئەوسا باش بزانن وا من بۆ مەدینە کۆچ دەکەم، جار هەرکەسێ دەیەوێ دایکی شینی بۆ بکات یان ژنی ببێتە بێوەژن و منالی هەتیو بێت، ئەوا با لەدووم بێتە ئەودیو کێوە و رێم لێ بگرێ.

ئیمامی عەلی دەڵێ: نەکەس وێرا وەڵامی بداتەوە نەکەسیش وێرا لەدووی بچێ، وەهەرکەسێکیشی کۆچی کردبێ بەدزی بوو، تەنها ئیمامی عومەر نەبێ.
ئەوە پاڵەوان و مەردی راستەقینەیە.

## ٣٠- لەپاش پێغەمبەر ژیانمان بۆ چییە؟

لەجەنگی ئوحد ئەنەسی کوڕی نەچەر دیتی وا هەندێك موسڵمان دانیشتوون، کەچاوی پێیان کەوت وتی: ئەوە بۆچی دانیشتوون؟ ئەوانیش وتیان پێغەمبەری خوا کوژراوە، ئەویش وتی: باش ئەگەر پێغەمبەری خوا کوژرابێ ئێوە ژیانتان بۆ چییە لەپاش ئەو؟ ئەمەی ووت و رووی کردەوە دوژمن و بەناویان کەوت، جەنگێکی پێشمەرگانەی کرد و پاش ئەوەی حەفتا برینی لێ کرا ئینجا بەشەهیدی گیانی دەرچوو، وەلەدوای جەنگ لەبەر برین و خوێن کەس نەیناسییەوە تەنها خوشکەکەی نەبێت کەبەپەنجەکانی ناسییەوە.

## ٣١- ئەو ناز و نیعمەتەم ناوێ

موصعەبی کوڕی عومەیر پێش ئەوەی ببێتە موسڵمان لاوێکی هەرچەند بڵێی قۆز بوو، دایکیشی هەرچی بڵێی ئافرەتێکی دەوڵەمەند و دەست رۆیشتوو بوو، بۆیە بەهەموو شێوەیەك مەسرەفی لەموصعەب دەکرد و نازی رادەگرت، موصعەب جوانترین جلی لەبەردەکرد و خۆشترین بۆن و بەرامی لەخۆ دەدا، ئەو بۆن و بەرام و گوڵاوەی ئەو لەخۆی دەدا کەس نەیبوو، بۆیە بەکۆڵانێك دادەڕۆیشت، دەیانزانی ئەوە موصعەبە.

موصعەب کەزانی ئاینێکی نویّ هاتۆتە کایەوە هەستا بەنهێنی خۆی گەیاندە پێغەمبەر و هاوەڵەکانی کەئەوکاتە بەنهێنی لەماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەم کۆدەبوونەوە و لەویّ بووە موسڵمان.

دایکی کەزانی موصعەب بوویتە موسڵمان دونیای لیّ هەڵگێڕا و ئاو و خۆراکی بەگەرووی تاڵ کرد و لەماڵیّ دەری کرد و لەموڵکی خۆی بیّ بەشی کرد تاکو موصعەب پەشیمان ببێتەوە، بەڵام موصعەب ئاوا ساویلکە نەبوو کەبەماڵ و جل و بەرگ هەڵبخەڵەتیّ و بەڵکو زیاتر لەسەر ئاینەی سوور بوو، بەم شێوەیە موصعەب ئەو ماڵە گەرمە و ئەو ژیانە پڕ لەگوزەرانییە و ئەو ناز و نیعمەتەی کەهەیبوو هەموو فڕیّ دا و هەمووی بەجیّ هێشت، بیّ گومان ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کەلەئاگری جەهەننەم قوتاری ببیّ، بەڵیّ موصعەب هەروا مایەوە، هەر شەویّ لەماڵی برایەکی موسڵمانی دەنوست، زۆرجاریش هەر لەشەقام و کۆڵانەکان دەمایەوە.

## ٣٢- برای ئاینی لەپێش برای خوێنە

لەجەنگی بەدر ئەبو عەزیزی کوڕی عومەیریش بەدیل گیرابوو، ئەبو عەزیز برای موصعەبی کوڕی عومەیرە و لەجەنگەکەش خۆی هەڵگری ئاڵای کافرەکان بوو، لەهەمان کاتیشدا موصعەبی برای هەڵگری ئاڵای موسڵمانەکان بوو.

جا کەموصعەب چاوی بەئەبو عەزیزی برای کەوت وا یەکێك لەموسڵمانەکان دەستی دەبەستێتەوە، بەموسڵمانەکەی ووت: برام باش دەستی ببەستە، دایکی زۆر دەوڵەمەندە بەڵکو بەپارەی باش بەڕەڵای بکات، لێرەدا ئەبوو عەزیز هاتە

قسەکردن: موصعەب تۆ برای خۆمی ئەوجا وەها دەڵێی، ئەدی ئەگەر یەکێکی تر بوایە دەبا چی ووتبایە، موصعەبیش ووتی: ئەوە برای منە نەك تۆ.

## ٣٣- کۆتایی ژیانی موصعەب

ئەو موصعەبە بەناز و فیزە بۆن خۆش و قۆزە دەبێ چۆن ژیانی کۆتایی پێ هاتبێ؟

لەجەنگی ئوحد موسڵمانەکان زیاتر لەحەفتا کەسیان لێ شەهید کرا، ئەو شەهیدانەش دوو پاڵەوانی هەرە مەرد و ئازای ئیسلامیان تیادا بوو، شێری خوا حەمزی کوڕی عەبدولموتەلیب، وەهەڵگری ئاڵای پێغەمبەر موصعەبی کوڕی عومەیر.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر بۆ ئەو دوو پاڵەوانە دڵی تەنگ بوو و خەمی خوارد کەموصعەبیان هێنا بیشارنەوە، لەگوشێك زیاتر هیچی تر نەبوو بۆی بکەنە کفن، ئەو گوشەیان لەلای سەری پێ دادەپۆشی قاچی هەتا چۆکی رووت دەبوو، وەکەلەلای قاچیشیان وەردەگرت، سەری هەتا سنگی رووت دەبوو، پاشان پێغەمبەر فەرمووی: گوشەکە لەلای سەری بگرن و قاچیشی بەگیا داپۆشن، بەم شێوەیە بەسەرهاتی ژیانی جوانترین و قۆزترین لاوی مەککە کۆتایی پێ هات.

## ٢٤- ئەگەر خوا حەزبکا من دەیکوژم

ئوبەی کوڕی خەلەفیان کافرێکی زۆر دڕندەبوو، ماوەیەکی درێژبوو وولاخێکی ڕاگرتبوو و بەخێوی دەکرد، وەدەیووت: لەسەر پشتی ئەو وولاخە موحەممەد دەکوژم پێغەمبەریش دەیووت: گەر خوا حەز بکا من ئەو دەکوژم، لەجەنگی ئوحد لەوکاتەی پێغەمبەر و موسڵمانەکان لەناخۆشترین باردا بوون، وەلەوکاتەی پێغەمبەر ددانی شکابوو و رووومەتی بریندار کرابوو زۆر بێ هێز بوو بوو، ئوبەی بەوولاخەکەیەوە لەپێغەمبەر هاتە پێشەوە و ووتی: ئەوە موحەممەدە دەیکوژم، کەنزیك بۆوە پێغەمبەر رمێکی لەسەحابەیەك وەرگرت و بۆ ئوبەی هاویشت و خستیە سەر زەوی، وادیار بوو کەئەو رمە جێگایەکی کوشندەی گرتبوو، بۆیە ئوبەی وەك گا دەیبۆڕاند و هەوڵی ئەوەی دا بۆ دواوە بگەڕێتەوە، بەڵام نەیتوانی و مرد.

## ٣٥- خێزانێکی قورئانی

لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی ئیسلام، وەها ئاسان نەبوو کەهەر یەکێك بەکەیفی خۆی بێتە سەر ڕێگەی ئەو ئاینە نوێیە، بەڵکو تووشی جۆرەها ئەشکەنجەو ئازاردان دەبوون.

وەلەوانە کەزۆر ئازار دران خێزانی یاسر بوو، یاسر خۆی و سومەییەی ژنی و عەمماری کوڕی بەسەختترین شێوە ئازار دەدران، بەئاگر و ئاسن دەموچاو و پشتیان داخ ئەکردن و لێیان ئەدان بۆ ئەوەی لەئاینی ئیسلام هەڵگەڕێنەوە و پەشیمان ببنەوە، بەڵام ئەوان بەنووری ئیسلام دڵیان رۆشن ببۆوە و تەنها بیریان

لەئاگری دۆزەخ دەکردەوە و ئەو سزایانەیان پێ هیچ نەبوو و هەر دەیانووت: لا إله إلا الله محمد رسول الله.

رۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەلایان تێپەڕی و بەدڵێکی زۆر بەخەمەوە فەرمووی: بەووره بن ئەی بەرەی یاسر، بەراستی جێگاتان بەهەشتە.. خوایە یارمەتی بەرەی یاسر بدەی.

بەو چەشنە بەبەردەوامی سزا دران هەتا یاسر لەژێر سزا مرد، رۆژێکیش سومەییە بەتوندی وەڵامی ئەبو جەهلی دایەوە، ئەویش زۆر بەنامەردی رمێکی لەوورگی دا و کوشتی، بەمەش سومەییە بووە یەکەم شەهید کەلەپێناوی ئاینی ئیسلامدا خوێنی رژابێ.

## ٣٦- عەممار پڕە لەباوەڕ

هەرچی عەمماریش بوو، رۆژ لەدوای رۆژ سزای سەختتر دەبوو، جارێك بەئاگر داخیان دەکرد، جارێك لەناو ئاودا نقومیان دەکرد، پێیان دەووت: لێت ناگەڕێین و وازت لێ ناهێنین هەتا بەخراپە باسی موحەممەد نەکەی و بەچاکەش باسی خوایەکانمان (بتەکانمان) نەکەی.

رۆژێك عەممار لەبەر ئازار و ئەشکەنجەی سزایەکانی ناوی بتەکانی هێنا ئەوجا بەرەڵایان کرد و بەریان دا، عەممار بەگریان هاتە خزمەت پێغەمبەر و هاواری بۆ هێنا، پێغەمبەریش فەرمووی چیت کردووە؟ ئەویش ووتی: کارێکی زۆر خراپم کردووە، وەهام ووت و وەهام کرد، پێغەمبەریش پێی ووت: باشە دڵت چۆنە؟ ووتی: بەخوا دڵم زۆر باشە و لەسەر باوەڕێکی پتەو دامەزراوە و نەگۆڕاوە.

خەڵکی ووتیان عەممار خۆی کافر کردووە، پێغەمبەر فەرمووی: نەخێر.. عەممار هەر لەسەری هەتا بنی پێی پڕە لەباوەڕ.

عەممار هەر لەسەر ئیسلامەتییەکەی بەردەوام بوو و لەهەموو جەنگەکان لەگەڵ پێغەمبەر ئامادە بوو، لەپاش مردنی پێغەمبەریش هەر لەسەر ئەم حاڵە بەردەوام بوو و لەجەنگێك لەجەنگەکان شەهید کرا.

بەم شێوەیە هەموو ئەندامەکانی خێزانی یاسر لەپێناوی خوا خۆیان فیدا کرد و خوێنیان رژا.

## ٣٧- شمشێرەکەی پێغەمبەر

لەجەنگی ئوحد پێغەمبەر شمشێرەکەی خۆی دایە دەست ئەبو دوجانە، ئەبو دوجانە وەك پڵنگ هەڵمەتی برد و خۆی هاوێشتە ناو سوپای دوژمن و شمشێرەکەی پێغەمبەری خستە کارەوە، بەهەر یەکێ دەگەیشت لەت و پەتی دەکرد و دەیکوشت.

لەناکاو دیتی وا یەکێك لەناو موسڵمانە شەهید و بریندارەکان دەگەڕێ و کەلەشیان لەت و ناشیرین دەکات، ئەبو دوجانە خۆی فڕێ دایە سەری بەو نیازەی بیکوژێ، بەڵام دیتی ئەوە ژنە و هیندی کچی عوتبەی خێزانی ئەبو سوفیانە، بۆیە نەیکوشت و گەڕایەوە، چونکە پێی ناخۆش بوو شمشێری پێغەمبەری خوا بدا لەژن.

# ٣٨- هەڵوێستێکی ئیمامی ئەبوبەکر

کەپێغەمبەر و ئەبوبەکر لەشاری مەککە بۆ شاری مەدینە کۆچیان کرد، لەرێگادا بەشەو لایان دایە ئەشکەوتی ثەور، ئەوەش تاکو کافرەکان نەیاندۆزنەوە، چونکە ئەوان لەهەموو لایەك لەدوایان دەگەڕان تاکو بیانگرن و بیانکوژن.

ئەشکەوتەکە ماری تیادا بوو، ئیمامی ئەبوبەکر جلەکانی خۆی پارچە پارچە کرد و هەر هەندێکی لەناو کونێك دائەناو دای دەخست، بەڵام کونێك مایەوە کەجلەکانی بەشی نەکرد ئەویش دابخات بۆیە ئەبوبەکر بەپێی خۆی کونەکەی گرت، ئەوەش نەوەك مارێك بێتە دەرەوە و بەپێغەمبەری خواوە بدا.

لەوکاتەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سەری بەرانی ئەبوبەکر دابوو و پاڵی دابۆوە مارێك لەناو کونەکە بەپێی ئەبوبەکری وەدا، هەرچەند ئەبوبەکر زۆر ئێش و ئازاری پێ گەیشت بەڵام بەسەر خۆی دانەهێنا و نەیهێشت پێغەمبەر بزانێ.

ئەوانە بەم شێوەیە بۆ خۆیان هەوڵیان داوە و زەخیرەیان داناوە، ئەوجا توانیتیان خۆیان لەئاگری جەهەننەم قوتار بکەن، بەخوا ئەگەر ئێمەش وا نەکەین ئەوا پشتمان دەشکێ و لەئاگرەکەی جەهەننەم قوتار نابین.

## ٣٩- ئەو کوڕەم ناوێ

لەجەنگی ئوحد عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکر لەریزی لەشکری کافرەکان هاتە دەرەوە و داوای هاوسەری کرد بۆ زۆرانبازی، لەناو موسڵمانەکانیش ئەبوبەکر کەباوکی عبدالرحمن بوو هاتە دەرەوە تا زۆرانبازی لەگەڵ بکات و بیکوژێت، بەڵام پێغەمبەری خوا لێ نەگەڕا کەئیمامی ئەبوبەکر بۆی دەربچێت.

ئەوەیە موسڵمانی ڕاستەقینە، ئەوەیە ئەو کەسەی کەلەئاگری جەهەننەم قوتاری دەبێت، چونکە ئەوە هەموو شتێکی هەر لەپێناوی خوا داناوە و هەموو کارێکیشی لەپێناوی خوا کردووە، هەوڵی داوە کوڕی خۆی بکوژێ تەنها بۆ ئەوەی لەئاگری جەهەننەم قوتاری ببێ.

توخوا با ئێمە ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین: ئەوانە ئەوها خۆیان ماندوو کردووە ئەوجا لەئاگری جەهەننەم قوتار بووینە، توخوا دەکرێ ئێمە بەبێ ماندووبوون و خۆ هیلاك کردن وەکو ئەوان قوتار ببین؟ ئەگەر وا بوایە ئەوا ئەوانیش وەها خۆیان ماندوو نەدەکرد.

## ٤٠- پارچە چەرمێکی ووشك

لەساڵی حەوتەمی تەمەنی ئاینی ئیسلام، کافرەکان پاش ئەوەی بەهەموو جۆرێك ئازاری ئەوانەیان دەدا کەبەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست دەکەوتن، دیتیان ئازاردان و لێدان و کوتان هیچ سوودی نییە تاکو موسڵمانەکانی پێ لەو ئاینە نوێیە پەشیمان بکەنەوە، بۆیە ئەوجارە هەستان پەیوەندییان لەگەڵ بڕین، بەشێوەیەك بڕیاریان دا کە نەشتیان لێ بکڕن نەپێشیان بفرۆشن.

بەم جۆرە ماوەی سێ ساڵ پەیوەندی ئابووری و هەموو جۆرە پەیوەندییەکی تریشیان لەگەڵ بڕین، موسڵمانەکان لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا وەها نارەحەت و برسی ببون ئەگەر دوژمن چاوی پێیان بکەوتایە بەزەیی بەحاڵیان دەهاتەوە، وەلەو ماوەیەدا لەناو شاری مەککە هاتبوونە دەرەوە و لەدۆڵێك نیشتەجێ ببوون.

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص دەڵێ: شەوێك لەشەوەکانی ئەو سێ ساڵە بۆ ئیشی پێویست هاتمە دەرەوە، دیتم شتێك لەسەر زەوی کەوتووە، کەتەماشام کرد پارچەیەك چەرمی ووشك بوو، هەڵم گرتەوە و شووشتم و دوایی برژاندم و بەئاوەوە خواردم، سێ ڕۆژ بەوە ژیام.

## ٤١- صوهەیب قازانجی کرد

کەخوای گەورە ئەمری بەپێغەمبەر و موسڵمانەکان کرد شاری مەککە جێ بهێڵن و بچنە شوێنێکی تر کەبتوانن ئاینەکەیان بەتەواوی بگرن، ئیتر موسڵمانەکان دەستیان کرد بەکۆچ کردن بۆ شاری مەدینە.

جا کەصوهەیبی کوڕی سینان (صوهەیبی ڕۆمی) ویستی کۆچ بکات، کافرەکان پێیان ووت کەتۆ هاتیە ئێرە برسی و هەژار بووی، پاشان لەلای ئێمە پارە و پوولت زۆر بوو دەوڵەمەند بووی ئێستاش ئەوها بەئاسانی دەتەوێ بەخۆت و بەو پارەیەی هەتە بچییە دەرەوە؟ بەخوا سەهووی.

صوهەیب پێی ووتن: باشە ئەگەر هەموو پارە و ماڵ و سامانەکانم بۆ ئێوە جێ بهێڵم، لێم دەگەڕێن کۆچ بکەم؟ ئەوانیش ووتیان بەڵێ، ووتی: دە ئەوە هەموویم بۆ ئێوە بەجێ هێشت و هەموویم دایە ئێوە.

پاشان کەئەم شتەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە فەرمووی: صوهەیب قازانجی کرد.. صوهەیب قازانجی کرد.

ئەوانە بەم شێوەیە هەوڵیان داوە و زەخیرەیان داناوە ئەوجا توانیتیان خۆیان لەئاگری جەهەننەم قوتار بکەن، بەخوای ئەگەر مرۆڤ هەر بەنوێژ و ڕۆژی لەئاگری جەهەننەم قوتار ببوایە ئەوا ئەوانەش خۆیان وەها ماندوو و هیلاك نەدەکرد، بەڵام نەخێر ئەوانە دەیانزانی کەهەر نوێژ و ڕۆژی نییە.

## ٤٢- پاڵەوانی ئیسلام و پاڵەوانی کوفر

لەجەنگی خەندەق کافرەکان گەمارۆی موسڵمانەکانیان دابوو لەمەدینە و نەیاندەتوانی لەو چاڵە بپەڕنەوە کەموسڵمانەکان لەدەورەی شار هەڵیان کەندبوو.

کەئابلۆقەدانەکە درێژەی کێشا، هەندێك لەسوار چاك و پاڵەوانەکانی قورەیش هاتنە سەر لێواری شوێنێکی تەسکی چاڵەکە و ئەسپەکانی خۆیان تاودا و پەڕینەوە ناو شار، لەوانە عومروی کوڕی وەددی عامری و عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل و ضیراری کوڕی خەتتاب، کۆمەڵێکیش لەموسڵمانەکان بەسەرکردایەتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب هاتنە پێشیان و بەرەنگاریان بوون.

عومرو پاڵەوانێکی زۆر ناسراو بوو و تەمەنی نەوەد ساڵ دەبوو، هەر زۆرانبازییەکیشی کردبوو کابرای بەرامبەری کوشتبوو، عەلی پێی ووت: ئەی عومرو تۆ پەیمانت داوە بەخوا کەهەرکاتێ پیاوێکی قورەیشی بۆ یەکێ لەدووشت بانگت بکا تۆ یەکێکیان لێ وەردەگری وانییە؟ ووتی: بەڵێ، عەلی ووتی: دەئەوە من داوات لێ دەکەم کەباوەڕ بەخوا و پێغەمبەری خواو ئیسلام بێنی. عومرو

ووتی: پێویستم بەوە نییە، عەلی ووتی: مادام وەرە بەرامبەر.. یان دەمكوژی یان دەتكوژم، عومرو ووتی: بەخوا پێم خۆش نییە منالێكی وەكو تۆ بكوژم، عەلی ووتی: بەخوا من حەز دەكەم تۆ بكوژم.

كەعومرو ئەم قسانەی بەر گوێ كەوت هەر بەیەك جار ئاگری تێبەر بوو، شمشێرێكی لەئەسپەكەی خۆی دا و كوشتی و بەرەو عەلی هات و تێك گیرابوون و زۆر یەكتریان هێنا و برد، پاش شەڕێكی توند و تیژ خوا كردی عەلی عومروی كوشت، هەرچی رەفیقەكانیشی بوون سواری ئەسپەكانیان بوونەوە و رایان كرد، بۆ ئەودیوی چاڵەكە.

پاشان كافرەكان ناردییانە لای پێغەمبەر كە دە هەزار لیرە دەدەن ئەگەر لاشەكەی عومرویان بداتەوە، پێغەمبەر فەرمووی: بڕۆن بیبەنەوە ئێمە پارەی مردارەوەبوو ناخۆیان و پارەمان ناوێ.

## ٤٣- هەوڵی كوشتنی پێغەمبەر

رۆژێك ئەبو سوفیان لەیانەی قەومەكەی دانیشتبوو ووتی: ئەرێ ئەوە كەس نییە بچێ موحەممەد بكوژێ خۆ وا هەموو رۆژێ بەكەیفی خۆی لەبازاڕ و شار دەسووڕێتەوە؟! پیاوێك هات ووتی من دەچم، ئەبو سوفیانیش بەڵێنی دایێ ئەگەر ئەو كارە بكات هەرچی بوێت دەیداتێ، ووشترێك و كەلوپەلیان بۆ ئامادە كرد و بۆ شاری مەدینە ناردیان.

كابرا لەمەدینە لەهەواڵی پێغەمبەری پرسی و پێیان ووت وا لەمزگەوتە، ئەویش هەستا چووە مزگەوت و ویستی لەپێغەمبەر بێتە پێشەوە، بەڵام پێغەمبەر كەچاوی پێ كەوت یەكسەر فەرمووی: ئەو كابرایە نیازی خراپی هەیە

بیگرن، ئەسەدی سەحابەش توند کابرای ڕاکێشا و لەپێغەمبەری دوورخستەوە، لەم بینە و بەردەیەشدا کابرا خەنجەرەکەی لێ کەوتە خوارەوە.

پێغەمبەر لەکابرای پرسی: بۆچی هاتوویە مەدینە، ڕاستمان پێ بڵێ ناتکوژین، ئەویش هەموو مەسەلەکەی گێڕایەوە و پێغەمبەریش لێی خۆش بوو، کابرا ووتی: وەڵلاهی ئەی موحەممەد پێشتر لەهیچ کەسێك نەدەترسام، بەڵام کەچاوم بەتۆ کەوت ترسام، پاشانیش تۆ شتێکی وەهات زانی کەلەمن زیاتر کەس نەیدەزانی، وەڵلاهی بۆم ڕوون بۆوە کەتۆ پێغەمبەری و لەسەر هەقی وەحیزبی ئەبو سوفیانیش حیزبی شەیتانە، ئەمەی ووت و بووە موسڵمان.

لێرەدا دەبینین کەهەڵوێستی جوان و لێ بووردن چ ڕۆڵییان هەیە بۆ ئیسلامەتی، خۆ پێغەمبەر داوای لەکابرا نەکرد ببێتە موسڵمان، بەڵام کابرا ئەم هەڵوێست و ڕەفتارەی پێغەمبەری دیت یەکسەر بەخۆی بووە موسڵمان و باوەڕی هێنا.

## جەنگی هەڵگەڕانەوە

پاش مردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باری موسڵمانەکان زۆر تێکچوو، چونکە زۆر کۆمەڵی تازە موسڵمان بوو کەهێشتا بەتەواوی گوڵی ئیسلامیان بۆن نەکردبوو، لەئاین هەڵگەڕانەوە، بەمەش ڕانەوەستان، بەڵکو بوونە دوژمنی ئاینەکەش و نیازی شەڕیشیان هەبوو، ئەوەی بەموسڵمانی مابۆوە تەنها موسڵمانەکانی مەککە و مەدینە و طائیف بوون، چەند کۆمەڵێکی تریش لەولا و لەملا هەبوون، ئەوانەش بۆیە هەڵنەگەڕانەوە، چونکە پەروەردەی دەستی

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون و بەباشی لەئاینی ئیسلامی پیرۆز گەیشتبوون.

ئەو کارەساتە و چارەسەرکردنەکەی زۆر نموونەی فیداکاری تیادا بوو کەبەیارمەتی خوای گەورە هەندێکیان بەکورتی باس دەکەین.

## ٤٤- بڕیارێکی مێژوویی

ئەبوبەکری پاڵەوان کەلەدوای مردنی پێغەمبەر بووە سەرکردەی موسڵمانان بەم کارەساتە (کارەساتی هەڵگەڕاوەکان) دڵی زۆر ناڕەحەت بوو، بەڵام دەستبەتاڵ رانەوەستا، بەڵێ.. ئیمامی ئەبوبەکر لەوکاتە ناسکەدا بڕیارێکی مێژوویی دا کەرۆڵێکی گرنگی هەبوو لەهێشتنەوەی ئاینی ئیسلام بڕیاری دا لەگەڵ ئەو کەسانە بجەنگێ کەلەئاین هەڵگەڕاونەتەوە و دەیانەوێت لەموسڵمانەکان بدەن.

ئەبوبەکر (رضی الله عنه) ئەو موسڵمانەی کەمابوون کردیە (١٢) لەشکر، لەشکرێکی دانا بۆ پارێزگاری کردنی پایتەخت و ئەوانی تریشی نارده ناوچەکانی دوورگەی عەرەبی بۆ شەڕکردن لەگەڵ هەڵگەڕاوەکان.

ئەو بڕیارەی ئەبوبەکر بۆیە گرنگ و مێژوویی بوو، چونکە تەنها دەستەیەکی کەم لەسەر ئاینی ئیسلام مابوونەوە، واتە مانەوەی ئاینی ئیسلام لەسەر مانەوەی ئەو دەستەیە راوەستابوو، ئەگەر بهاتوبایە ئەوانە بکوژرابانایە یاخود لەناو چووبانایە ئەوا ئاینی ئیسلام لەناو دەچوو بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین کەخوای گەورە بەڵێنی داوە هەتا دونیا ماوە ئەو قورئانە بپارێزێ، وەهەتا قورئانیش مابێ ئاینی ئیسلام لەناو ناچێ.



# ٤٥- خالید چۆن دەشکیّ؟!

یەك لەو خوا نەناسانەی کەلەئاین هەڵگەڕابۆوە موسیلەمەی درۆزن بوو لەناوچەی یەمامە، موسەیلەمە و قەومەکەی تەنها ساڵێك پێش مردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ببوونە موسڵمان، هەر لەو کاتەی کەئەو کابرایە بووە موسڵمان دەستی کرد بەدرۆ و دەلەسە و ئاژاوە، پاشانیش کەپێغەمبەر کۆچی دوایی کرد، ئیتر هەر بەیەکجاری هەڵگەڕایەوە و خەڵکێکی زۆریشی بەدواکەوتبوو و خۆی کردبووە پێغەمبەر و لەشکرێکی چل هەزار کەسی پێك هێنابوو، ئیمامی ئەبوبەکریش لەشکرێکی بەسەرکردایەتی عەکرەمەی کوڕی ئەبوجەهل بۆ نارد.

لەشکری ئیسلام و لەشکری کوفر لێکیان دا، بەڵام لەشکری ئیسلام خۆی نەگرت، خەلیفەش هەستا لەشکرێکی تری بەسەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید نارد بۆ یارمەتی دانی لەشکرەکەی یەکەم، دیسان لەسەر خاڵی یەمامە لەگەڵ لەشکری خوا نەناسەکان لێکیان دا، بەڵام بەداخەوە ئەوان زۆر بوون و موسڵمانەکانیان شکاند، شکانەکەش زۆر سەخت بوو بەشێوەیەکی ئەوتۆ خێوەتی سەرکردایەتی کەوتە دەست دوژمن و لەبنا هەڵیان کێشا.

ئەو خالیدەی کەبەسێ هەزار موسڵمانی رەش و رووت و دەست بەتاڵ لەجەنگی موئتەدا بەهۆی تەکتیکە عەسکەرییە جوانەکان لەشکری گەورە و بەهێزی رۆمەکانی راونا، دەبێ چی بەسەر هاتبێ ئەورۆکە لەشکرەکەی ببێتە خۆراکی بەردەمی نامەردەکەی مونافیقەکان وایان بەسەر هاتووە؟ کەی ئەمە ئازایەتی موسڵمانە؟ چۆن وەها بەئاسانی مەیدانیان چۆڵ کرد؟ موسڵمانەکان سەرنجیان دا، ئەگەر وەها برۆن ئەوا ئاینەکەیان لەلەناوچوون نزیکە.. ئەگەر ئەمڕۆکە موسیلەمە سەرکوت نەکەن، پێویستە دەست لەئیسلامی ئازیزیان

بشۆن.. ساڵەهای ساڵە ئازار و ناڕەحەتی دەچێژن لەپێناوی ئیسلاما وەخزمەتی قورئانی پیرۆز ئەکەن و خوێنیان ئەڕێژن و لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویست ماندوو ئەبن و ئارەقە ئەڕێژن، توخوا حەیف نییە ئەمڕۆ ئەو هەموو هەوڵ و کۆشش و ماندووبوونەیان بەهیچ دەربچێ؟

هەر موسڵمانێك سەرنجی دەدا دەیزانی ئەوە شکاندنی ئەو پەیمانەیە کەلەگەڵ خوای گەورەی بەستووە، چۆن دەبێ ئەو زیندوو بێ و ئیسلامی خۆشەویستیش دەست درێژی بخرێتە سەر؟ چۆن دەبێ ئەو زیندوو بێ و حکومەتی ئیسلام کەلەلایەن پێغەمبەری خواوە دامەزرابێ بڕووخێندرێ؟ چۆن دەبێ ئەو زیندوو بێ و پایتەختی ئیسلام و شاری پێغەمبەری بکەوێتە چەنگ دوژمن؟ چۆن دەبێ ئەو زیندوو بێ و شەرەفی موسڵمان بکەوێتە ژێر دەست کافرەوە؟

هەر موسڵمانێ سەرنجی ئەدا بۆی دەردەکەوت ئەگەر ئەمڕۆ لەم جەنگەدا ئیسلام بدۆڕێنێ ئەوا حکومەتی ئیسلام دەڕووخێ و پایتەختی ئیسلامیش دەکەوێتە بەردەستی کافرەکان، لەبەر هەموو ئەو هۆیانە هەموویان بڕیاریان دا: مردن باشترە لەوەی بمێنن و ئیسلام بەشکاوی ببینن.

ئەو خالیدەی دوێنێ موسڵمانەکانی لەجەنگی ئوحد شکاند ئەمڕۆکە چۆن دەهێڵێ کوفر بەسەر لەشکرەکەی دا زاڵ بێ؟ خالید دوێنێ موسڵمانەکانی شکاندووە، ئەمڕۆش دەبێ کارێکی وەها بکات کەهی دوێنێ بسڕێتەوە.

ئەوجارە موسڵمانەکان هێرشیان بردە سەر کوفر، بەڵام چ هێرشێك؟ هەرگیز پێشتر هێرشی وەهیان نەبردبوو، وەها نەنگیان بەکوفر هەڵچنی و بەشێوەیەك هەر بابای ئەوەیان بوو رابکەن، ئینجا دوای کوشتن و برینێکی زۆر ناچار بوون

رابکەن و پەنا بەرنە بەر ئەو باخچەیە گەورەیەی کەموسەیلەمە ناوی لێنا بوو بەهەشتی سەرزەمین، باخچەکە زۆر گەورە بوو، دیوارەکای بەرز و سەخت بوون و وەك قەلاّ وابوو لەشکرەکەی موسەیلەمە چووە ناوی و دەرگاکەی لەسەر خۆی داخست، ئیتر موسڵمانان هەرچەندی کردیان و کردیان هیچیان پێ نەکرا، چونکە نەیاندەتوانی بچنە ناو باخچەکە، نەك هەر ئەوەش بەڵکو هەر نەشیان دەتوانی لەدیواری قەلاّیەکەش نزیك ببنەوە، چونکە بەچڕی تیرباران دەکران، بۆیە بەناچاری لەچواردەوری قەلاّیەکە نیشتن.

## ٤٦- بمهاوێنە ناو باخچەکە

بەراستی کاتێکی تەنگ و ناخۆش بوو، ئەوڕۆکە ئەگەر واز لەموسەیلەمە بهێنن و بگەڕێنەوە، ئەوا سبەی کەموسەیلەمە خۆی گرتەوە ئەوا لەپایتەخت دێتە سەریان، چونکە موسەیلەمە دەیویست بەتەواوی نووری ئیسلام بکوژێنێتەوە، لەلایەکی تریش نەدەکرا ئەو لەشکرە هەر لەچواردەوری ئەو باخچەیە بمابایەوە، چونکە لەشکریش پێویستی بەخواردن و خۆراك هەیە.

لەناکاو دەنگێك لەناو لەشکری موسڵمانەکان بەرز بۆوە و هاواری کرد: براینە ئێوە لەنزیك دەرگایەکە بەرزم بکەنەوە و بمخەنە ئەودیوی باخچەکە ئەوا یان دەبێ لەوێ شەهید بم، یانیش دەبێ دەرگایەکە بکەمەوە، دەزانن ئەوە کێ بوو؟ ئەوە بەرائی کوڕی مالیك بوو.

ئایا یەکێکی وەکو بەراء بۆ پلە و پایە و کورسی ئەو بڕیارەی دا؟ بۆ پارە و پوول بوو؟ بۆ خۆهەڵکێشان بوو؟ نەخێر، بۆ قوتاربوون بوو لەئاگری جەهەننەم.

بەراء ئەوەندە کەڵەگەت و لەش زل نەبوو، بەڵام ئەو باوەڕە بەرزەی کەلەدڵی قەتیس بوو بوو، ئەگەر برژابایە دونیای پڕ دەکردەوە، برایەکانی بڵندیان کرد، بەراء بەدەیا تیر و رمی بۆ دەهات، بەڵام توانی خۆی فڕێ بداتە ئەودیو، بەڵێ بەراء بەخۆی خۆی هاوێشتە ناو قورگی شێر.

ئەو کابرایە بەبەدەن لاواز و بێ هێزە بکەوێتە ناو هەزارەها خوانەناسی دەبێ حاڵی چۆن بێ؟ لەهەموو لایەك تیر و رم و شمشێری بۆ دەهات بەڵام پیاوی بەغیرەت هەر بەغیرەتە، وەغیرەتیش بەبەدەن نییە، بەڵکو بەباوەڕ و بەئیمانە، بەراء توانی خۆی بگەیەنێتە دەرگایەکە و لەرێگاشدا دە خوانەناسی کوشت و ئینجا دەرگایەکەی کردەوە، بەڵام پاش چی؟ پاش ئەوەی کەهەشتا برین زیاتری لێ کرا بەرم و شمشێر و تیر.

ئینجا کەدەرگا کرایەوە موسڵمانەکان وەك ئاوی لافاو رژانە نێو باخچەکە، دوژمنیان لەت و پەت کرد، بیست هەزاریان لێ کوشتن، بەڵام ئەوان هەر نەشکان، پاشان موسڵمانەکان خۆیان گەیاندە موسەیلەمە و بەدۆزەخیان گەیاند ئینجا لەشکرەکەی موسەیلەمە سارد بۆوە و وازی هێنا.

بەم شێوەیە ئاینی ئیسلام بەسەلامەتی لەگەورەترین و قوڵترین دەریا پەڕییەوە، پاش ئەوەی کەهەندەی نەمابوو تیایدا نقووم بێت، هەر لەو رۆژەشدا باخچەکەی موسەیلەمە ناوی کرا بە (باخچەی مردن) پاش ئەوەی ئەو هەموو خوانەناسەی تیا کوژرا.

## ٤٧- چیم بۆ کوفر کردووە و ئاواش بۆ ئیسلام دەکەم

کەمرۆڤ لەناو نەفامی دێتە ناو ئیسلام پێویستە پێش هەموو شتێك بیر لەوە بکاتەوە کەکاتی خۆی چ کارێکی بۆ کوفر کردووە ئێستاش ئەوها بۆ ئیسلام بکات و بەڵکو زیاتریش، ئەوەش تاکو کارەکانی پێشووی بسڕێتەوە و بۆ خوای گەورەش بسەلمێنێ کەبەراستی بۆ ئاینی ئیسلام دڵسۆزە، چونکە ئەگەر وانەکات ئەوە مانای ئەوەیە هێشتا ئەوەندە بۆ ئیسلام دڵسۆز نییە وەك ئەوەی کاتی خۆی بۆ کوفر دڵسۆز بووە، هەربۆیەش بوو ئەوانەی کەلەسەر دەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)دەبوونە موسڵمان و پێشتر دوژمنایەتی ئیسلامیان کردبوو، ئەوجارە زیاتر دوژمنایەتی کوفریان دەکرد، بۆ نموونە وەك عومەری کوڕی خەتاب و خالیدی کوڕی وەلید و عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل و زۆری تریش.

وەحشی حەبەشیش یەکێك بوو لەوانەی کەئەو راستییەیان دەزانی، وەحشی لەجەنگی ئوحد باشترین پاڵەوان و سوارچاکی ئیسلام و نزیکترین خزمی پێغەمبەر (حەمزە)ی کوشت ئەو حەمزەی کوشت کە چ لەمەککە چ لەمەدینە رۆڵێکی گرنگی دەدیت لەبەرێوەبردنی ئاینی ئیسلام، ئەو وەحشییە کەبووە موسڵمان ئەو رمەی کەلەئوحد حەمزەی پێ کوشتبوو هەڵی گرتبوو وەهەمیشە دەیووت: من بەم رمە شێری خوام کوشتووە و دەبێت دوژمنێکی گەورەی خواش بکوژمەوە.

هەر لەجەنگی یەمامە و هەر لەناو (باخچەی مردن) وەحشی لەناو خوا نەناسەکان لەموسەیلەمە دەگەڕا، کەچاوی بەموسەیلەمە کەوت رمەکەی بۆ هاویشت و خستیە سەر زەوی و بۆ دۆزەخی نارد، وەحشی هەرچەند هەتا مرد کارەساتەکەی حەمزەی هەر لەبیر نەکرد، بەڵام کەموسەیلەمەی درۆزنی کوشت دڵی خۆی رەحەت کرد.



## ٤٨- با وەك حەمزە شەهید بم

لەجەنگی بەنی قورەیضە موسڵمانەکان بیست و پێنج ڕۆژ بوو ئابڵوقەی قەڵای جوولەکەکانیان دابوو نەیاندەتوانی قەڵایەکەیان بگرن پاشان ئیمامی عەلی (رضی الله عنه) لەناو سوپایەکەی ئیسلام هاواری کرد: ئەی کۆمەڵی موسڵمانان بەخوا یان دەبێ وەك حەمزەم لێ بێ یان قەڵایەکەیان دەکەمەوە و دەیانگرم، ئینجا هێرشی برد و قەڵایەکەی کردەوە، بەم جۆرە موسڵمانەکان توانیان هەموو جوولەکەکان بگرن.

## ٤٩- دوو پاسەوانەکە

لەجەنگی (ذات الرقاع) پێغەمبەر و موسڵمانەکان شەوێ چوونە دۆڵێك، پێغەمبەر بەسەحابەکانی ووت: کێ ئەو شەو پاسەوانیمان دەکات؟ عەمماری کوڕی یاسر و عەببادی کوڕی بەشر ووتیان: ئێمە عەبباد بەعەمماری ووت: ئەگەر حەز دەکەی من تا نیوەی شەو ناخەوم و پاسەوانییەکەی دەگرم، تۆش لەنیوەی دووەم پاسەوانییەکە بگرە، عەمماریش ووتی باشە.

عەممار نووست و عەببادیش دەستی کرد بەنوێژکردن لەولاش کافرێك چاوی بەعەبباد کەوت و زانی سەربازی موسڵمانەکانە تیرێکی هاویشت و لێی دا، بەڵام عەبباد نوێژەکەی نەبڕی و تیرەکەی لەلەشی دەرهێنا، کابرا تیرێکی تریشی لێ دا، بەڵام عەبباد هەر نوێژەکەی نەبڕی و ئەویشی دەرهێنا ئەوجارە تیری سێیەمی لێ دا، عەبباد لەکاتی سوجدە عەمماری ڕەفیقی هەشیار کردەوە، کابراش کەزانی ئەوان دوو کەسن ڕای کرد.

عەممار کەدیتی لەشی عەبباد هەمووی خوێنە پێی ووت: برام ئەدی بۆ خێرا بانگت نەکردم؟ عەبباد ووتی: وەڵلاهی سوورەتێکم دەخوێند نەم ویست بیبڕم، بۆیە هەتا تەواوم نەکرد و نەچوومە سوجدە نەمتوانی ئاگادارت بکەمەوە.

## ٥٠- کێ ئەبو رافیعم بۆ دەکوژێ؟

ئەبو رافیع گەورەی جوولەکەکانی خەیبەر بوو، ئەو کابرایە هەمیشە هەوڵی دەدا عەرەبەکان و جوولەکەکان لەگەڵ پێغەمبەر دوژمنایەتی بکەن و لەگەڵی بجەنگن.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زۆر بەکار و هەڵسوکەوتەکانی ئەو کابرایە پەست و نارەحەت بوو بوو، بۆیە رۆژێك بەیارەکانی خۆی فەرمووی: کێ ئەبو رافیعم بۆ دەکوژێ؟ یەکسەر عەبدوڵلای کوڕی عەتیل و چوار موسڵمانی تر هەڵسان ووتیان: ئێمە پێغەمبەری خوا، شایانی شانازییە سەحابەکان هەمیشە بابایان بوو پێغەمبەر ئەمرێك بکات تاکو ئەوان جێ بەجێی بکەن و خێریان بۆ بنووسرێ.

ئەو پێنج کەسە چوونە خەیبەر، لەوێ عەبدوڵلا لەبەر دەرگای قەلای جوولەکەکان ووتییە رەفیقەکانی ئێوە لێرە بوەستن، بەخۆشی بەفروفێڵ پێش ئەوەی پاسەوانەکە دەرگای قەلایەکە دابخات چووە ژوورێ، پاشان ماوەیەك خۆی لەژوورێ شاردەوە تا پاسەوانەکە نوست، کلیلەکانی لێ برد و دەرگایەکەی کردەوە، ئەوەش بۆ ئەوەی لەدوای گەڕانەوەدا بتوانێ رابکات.

پاشان عەبدوڵلا رووی کردە ماڵی ئەبو رافیع و چووە ناو ماڵیان، دەرگا بەدەرگا چووە ژوورەوە هەتا گەیشتە ژوورەکەی ئەبو رافیع کەلەناو ماڵ و

منداڵەکانی خۆی پاڵی دابۆوە ژوورەکەی تاریك بوو، لەبەرئەوە عەبدوڵڵا نەیدەزانی کامە جێگای ئەبو رافیعە، بۆیە بانگی کرد: ئەبو رافیع ئەبو رافیع، ئەبو رافیعیش ووتی: ئەوە کێیە؟ یەکسەر عەبدوڵڵا بەرەو شوێنی دەنگەکە رۆیشت و هەتا گرتی شمشێرێکی لێ دا، لێرەدا ژنەکەی ئەبو رافیع ووتی: کوڕە ئەبو رافیع ئەوە دەنگی عەبدوڵڵای کوڕی عەتیك بوو هات، ئەبو رافیع ووتی: کچێ عەبدوڵڵا ئەم شەوە لێرە چی دەکات؟

لێرەدا عەبدوڵڵا دەنگی خۆی گۆڕی و ووتی: ئەدی ئەوە کێیە لێرە؟ ئەبو رافیعیش وای زانی ژنەکەیەتی پرسیاری لێ دەکا بۆیە ووتی: کچێ یەکێك شمشێرێکی لێ دام، لەم قسەیە ئەبو رافیع بۆی دەرکەوت کەشمشێرەکەی پێشووی لەئەبو رافیعی دابوو، ئەوجارەش هات هەتا توانای تیابوو شمشێرێکی تریشی لەورگی دا و کوشتی.

عەبدوڵڵا خۆی بینایی چاوی لاواز بوو، بۆیە لەگەڕانەوەدا لەسەر قاڵدرمەکانی ماڵی ئەبو رافیع کەوتە خوارەوە و قاچی شکا، بەڵام ئەو یەکسەر بەمەندیلەکەی سەری قاچی بەستەوە و خۆی گەیاندە رەفیقەکانی و ووتی: ئەبو رافیعم کوشتووە با بڕۆین.

ئیتر هەموویان بەسەلامەتی گەڕانەوە مەدینە و هەموو بەسەرهاتەکەیان بۆ پێغەمبەر گێڕایەوە، پێغەمبەریش دەستێکی بەسەر قاچی عەبدوڵڵادا هێنا و یەکسەر شکانەکەی چاك بووەوە و قاچی لەجاران بەهێزتر بوو.

# ٥١- دڵسۆزی

جەلاسی کوڕی سوەید یەکێك بوو لەدووڕووەکان، وەیەکێك بوو لەوانەی کەلەموسڵمانەکان دابڕان و بۆ جەنگەکەی تەبووك دەرنەچوون، ئەو جەلاسە رۆژێك قسەیەکی ناشیرین دەرهەق پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات.

عومەیری کوڕی سەعیدیش گوێی لێ دەبێ.

شایانی باسە کاتی خۆی جەلاس دایکی عومەیری مارە کردبۆوە پاش مردنی سەعیدی باوکی، واتە جەلاس زڕ باوکی بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا عومەیر کەقسەکەی بەر گوێ کەوت بەجەلاسی ووت: ئەی جەلاس تۆ خۆشەویسترین کەسی لەلای من و لای من زۆر بەڕێزی، وەهەرگیز حەز ناکەم رۆژێك تووشی هیچ ناخۆشییەك بی، بەڵام قسەیەکی وەهات کرد ئەگەر بێتو بچم بیگێڕمەوە ئەوا تووشی شەرمەزاری دەبی، ئەگەریش خۆم کڕ بکەم و نەیگێڕمەوە ئەوا ئایینەکەم لێم رازی نابێ، ئێستا نازانم کامیان بکەم؟!

پاشان هەستا چووە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و هەموو قسەکانی جەلاسی زڕ باوکی بۆ گێڕایەوە، جەلاسیش هاتە لای پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) سوێندی بەخوا خوارد کەئەو جۆرە قسەی نەکردووە و عومەیر درۆی بەدەمی کردووە.

ئینجا خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە مەسەلەکەی بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) روون کردەوە کەعومەیر راست دەکات و جەلاس ئەم قسەیەی کردووە.

پاشان کەجەلاس ئەم ئایەتەی بیست هاتە لای پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) دانی بەکارەکەی خۆی نا و ووتی: عومەیر ڕاست دەکا و من ئەم قسەیەم کردووە، پاشان تۆبەی کرد و تۆبەکەی لێ وەرگیرا.

## ٥٢- عومەر حوکمی خوای دەوێت

جارێکیان دووڕوویێك لەگەڵ جوولەکەیەك دەکەونە مشت و مڕ، جوولەکەکە دەڵێ با بچینە لای موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) با ئەو ناوبژیمان لەنێوان دا بکات، بەوەی کەبەپاکی دادوەری ناسراوە، دووڕووەکەش ووتی: نا با بچینە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف (کەگەورەی جوولەکەکان بوو لەو کاتەدا)، ئەوەش چونکە جوولەکە هەمیشە بەوەرگرتنی بەرتیل و بەرتیل خۆری ناسراون، لەکۆتایی دا بڕیاریان هاتە سەر ئەوە بچنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) حوکمی لەنێواندا کردن و مافی دایە جوولەکەکە.

بەڵام دووڕووەکە بەمە ڕازی نەبوو هەستا لەگەڵ کابرای جوولەکە چوونە لای ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه)، ئەویش هەمان شت مافی دایە جوولەکەکە، بەڵام دووڕووەکە بەحوکمی ئەویش ڕازی نەبوو، ووتی دەبێ بچینە لای عومەری کوڕی خەتتاب.

کەچوونە لای عومەر پێی ووت: پێش تۆ چووینە لای موحەممەد و پاشان لای ئەبوبەکر، بەڵام ئەو کابرایە بەحوکمی هیچ کامێکیان ڕازی نەبوو، ئیمامی عومەر بەدووڕووەکەی ووت: وایە؟ ووتی: بەڵێ، پاشان ووتی: دەباشە لێرە بووەستن ئێستا دێمەوە.

چوو لەژووریّ شمشێرەکەی بەست و هەر هاتەوە لایان یەکسەر شمشێرێکی لەملی دووڕووەکەدا و کوشتی، ئینجا ووتی: ئاوا حوکمی ئەو کەسە دەکەم کەبەحوکمی خوا و پێغەمبەری خوا هاوەڵی پێغەمبەری خوا رازی نەبێ.

پاشان هەواڵ بڵاوبۆوە و گەیشتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کەگوایە عومەر موسڵمانێکی کوشتووە.. پێغەمبەر فەرمووی: عومەر چۆن کارێکی وای کردووە؟ بەڵام پاشان ئایەت دەربارەی مەسەلەکە هاتە خوارەوە و حەزرەتی جبرائیل بەپێغەمبەری راگەیاند کەعومەر هەق و ناهەقی لێك جیا کردۆتەوە، ئیتر هەر لەو رۆژەوە نازناوی عومەر بوو بە (الفاروق) واتە: جیاکەرەوە.

## ٥٣- ئەوانەی لەژێر کەپرەکە دەژیان

ئەوانەی شاری مەککەیان بەجێ هێشت و بۆ شاری مەدینە کۆچیان کرد، زۆربەی زۆریان لەوێ نەخانوویان هەبوو نەخزم و کەس و کار و ناسیاویشیان هەبوو، زۆربەشیان رەش و رووت و دەستکورت بوون، لەتوانایان نەبوو بچن خانوو دروست بکەن یان بیکڕن، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەمری کرد لەمزگەوتەکەی کەپرێکیان بۆ دروست بکەن، ئیتر ئەو کەپرە بووە شوێنی حەوانەوەی چوار سەد کۆچەر.

ئەو کەپرە وەك قوتابخانەیەکی قورئانی و سەربازگەیەکی لێ هاتبوو چونکە ئەو رووت و هەژارانە لەژێری دا هەمیشە کاتی خۆیان بەخواپەرستی و لەبەرکردنی قورئان و فەرموودە و شارەزا بوون لەئایین بەسەر دەبرد.

رۆژێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لایان راوەستابوو و چاوی بەهەژاری خەبات و دڵشادی ئەوان کەوت، فەرمووی: ئەی خەڵکی کەپرەکە مزگێنی...

لەئوممەتی من ئەوەی لەبارودۆخێکی وەك ئەو بارودۆخەی ئێوە بژی و پێشی ڕازی بێ، ئەوا لەهەڤاڵەکانی منە لەبەهەشت.

شایانی باسە خەڵکە موسڵمانەکانی شار ئەوەی خواردنێکی لەماڵی خۆی شك ببردایە کەتاریکایی دا دەهات دەچوو بۆیانی دەبرد، ئەوەش تاکو کارەکەی نەبێتە ریا و ڕواڵەت یان هەژارەکان هەستیان بریندار بێ.

ئەوانە قوتابیانی قورئانن کەبەهەموو بارودۆخێکی خراپ و نالەباری دەژیان ڕازی دەبن کەتووشی دەبن بەهۆی ئەوەی ڕێی خوایان گرتووە، وەکەتووشی بارێکی وا ناخۆش دەبن دڵیان تەنگ نابێ، یان پەشیمان نابنەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە زۆر کەیف خۆشن و شادمان دەبن، چونکە ئەوانە دەزانن ئەوانەیان هەموو بۆ دەبێتە زەخیرەیەکی بەپیتی ڕۆژی قیامەت، وەدەزانن ژیان بێ ئومێدی و پڕوپووچە.

## ٥٤- هەژارەکان دەرناکەین!

جارێك هەندێ لەگەورە پیاوانی قورەیش بەلای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) تێپەڕین، لەوکاتەی چەند کەسێکی لەدەست کورت و هەژار و ڕەش و ڕووتی موسڵمانەکانی لەگەڵ دانیشتبوون وەك: صوهەیب و عەممار و بیلال و سەلمانی فارسی و خەبباب، ووتیان: ئەی موحەممەد تۆ لەو هەموو پیاوماقوڵ و پایەبەرزەوە چۆن بەو ڕەش و ڕووتانە ڕازی دەبی؟ ئایا خوا ئەو ڕەش و ڕووتانەی لەناو ئێمە هەڵبژاردووە و ئیمانی پێ بەخشیون؟ ئەو ڕەش و ڕووت و کۆیلانە ببنە پێشڕەو و ڕابەری ئێمە؟ ئێمە پێمان شەرمە بێینە لای تۆ و لەگەڵ ئەو گەدا و هەژارانە دابنیشین، دەلەلای خۆت دەریان بکە بەڵکو ئێمە بەدوات

بکەوین، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: من ئیمانداران دەرناکەم، ئەوانیش ووتیان: دەباشە بەلای کەمی کەئێمە دێینە لات ئەوان لەخۆت دوور بخەوە.

لەسەرەتا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەو تەماعەی بیانکاتە موسڵمان ویستی داواکەیان جێ بەجێ بکات، بەڵام خوای گەورە یەکسەر ئایەتی ناردە خوارەوە ئەمری بەپێغەمبەر کرد ئەو کارە نەکات.

ئەوەیە حەقیقەتی ئیسلام کەزۆر لەگەوج و داماوەکان هەوڵی شێواندنیان داوە و دەدەن، ئەوەیە ڕێزی خوا و ئیسلام بۆ هەژار و دەست کورتەکان.

ئیسلام هەرگیز جیاوازی لەنێو بەندەکان ناکات بەهۆی پلە و پایە و ماڵ و سامان، بەڵکو پێوەری جیاوازی بریتییە لەترسان لەخوا.

ئەوەیە ئەوەی بەتەواو تەسلیمی ئەمری خوای گەورە بێ، ئەوا خوای گەورە دەیکاتە ئەندام لەکۆمەڵی خۆی جا ئایا ئەو کەسە دەوڵەمەند بێ یان هەژار، ئەوەی تەسلیمی ئەمری خوای گەورە نەبێ بەتەواوی و لەسەدا سەد ئەوا ئەگەر ئەو جیهانە هەمووی هی ئەو بێ خوای گەورە وەری ناگرێ و نابێتە ئەندام لەو کۆمەڵە پایەبەرزە.

## ٥٥- قەرز بەخوا دەدات

زەیدی کوڕی ئەسلەم دەڵێ: کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ﴿٢٤٥﴾﴾ البقرة: ٢٤٥ [١]، أبو دحداح بەپێغەمبەری ووت (صلى الله عليه وسلم) باوك و دایكمت بەقوربان بێ ئەی پێغەمبەری خوا، باشە خوای گەورە قەرز لەئێمە وەردەگرێ لەكاتێكا پێویستی بەقەرزی ئێمە نییە؟

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەڵێ، دەیەوێ بەهۆی ئەو قەرزە بتانباتە بەهەشت، أبو دحداح ووتی: باشە ئەگەر من قەرزم بەخوای گەورە دا، ئایا ئەو قەرزە بەهەشت بۆ من و منداڵەكانم مسۆگەر دەكا؟ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەڵێ أبو دحداح ووتی: دەست بێنە ناو دەستم.

پێغەمبەریش دەستی خۆی دایە دەستی، ئینجا أبو دحداح ووتی: من دوو باخم هەیە یەكێكیان لە (السافلە)یە و ئەوی تریان لە (العالیە)یە، خوا شاهید لەماڵێ هەر ئەوەندەم هەیە، ئەوەش وا بەقەرز دەدەم بەخوای گەورە.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی یەكێكیان بۆ خوا دابنێ و ئەوی تریشیان بۆ بەڕێوەچوونی خۆت و منداڵەكانت لێ گەڕێ.

أبو دحداح ووتی: دە شاهێد بە ئەی نێردراوی خوای گەورە ئەوە من ئەوەی چاكترەكەیانم بۆ خوای گەورە دانا ئەوەی كەشەش سەد دار خورمای تیایە،

---

(١) واتە: كێ هەیە پڕ بەدڵ پارەی حەلاڵی خۆی لەپێناوی خوا سەرف بكا تا پاداشتی خوای گەورە وەربگرێت.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: کەواتە خوای گەورە بەبەهەشت پاداشتت دەداتەوە.

ئەوەیە نموونەی قوتابییە راستەقینەکانی قورئان، هەموو ئامانج و ئاواتیان رەزامەندی خوای گەورە و قوتار بوونە لەئاگری جەهەننەم، وەهەموو کارێکیان کردەوە و هەموو شتێکیشیان بەخشیوە بۆ وەدی هێنانی ئەو ئاواتەیان وەبەهەموو شێوەیەك زەخیرەیان بۆ خۆیان داگرتووە.

## ٥٦- کڵاوەی کەعب

لەجەنگی ئوحد پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) کڵاوێکی ئاسنی رەنگ زەردی لەسەر کردبوو، دیار بوو کافرەکان بەرەنگەکەیان زانی بوو بەهۆی ئەوەوە زۆربەی رم و تیرەکانیان ئاراستەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکرد.

کەکەعب بەم شتەی زانی هاتە لای پێغەمبەر و ووتی: ئەی نێردراوی خوا ئەو کڵاوە زەردە خۆت بدە بەمن و تۆ کڵاوەکەی من بخە سەر، کڵاوەکەی کەعب رەنگێکی تری هەبوو، پێغەمبەریش کڵاوەکەی خۆی لەگەڵ ئاڵوگۆڕ کرد و سوپاسی کرد و دوعای خێری بۆ کرد.

ئیتر کەعب کەوتە بەر تیر و رمی کافرەکان و لەزۆر لاوە تیر و رمی بۆ دەهات، شایانی باسە کەعب (رضی الله عنه) لەرۆژی ئوحدا لەیازدە جێگا لەشی بریندار بوو.

ئەوەیە دڵسۆزی تەواو بۆ خوای گەورە.

# ٥٧- موسڵمان بوونی ئەبوزەر

ئەبوزەری غەفاری (جوندبی کوڕی جونادە) یەکێکە لەو یارانەی کەزۆر زوو هاتنە ناو ئایینی ئیسلام (پێنجەم کەس بوو)، پیاوێکی زۆر هەق خواز بووە و هەرگیز لەووتنی هەق لەلۆمەی هیچ کەسێك نەترساوە، یەکەم کەس بووە بەسڵاوی ئیسلام سڵاوی لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کردووە، سێ ساڵ پێش ناردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وازی لەبت پەرستی هێنا بوو و خوای دەپەرست.

ئەبوزەر کەبەهەواڵی ئەو پێغەمبەرە نوێیەی زانی (صلی الله علیه وسلم)، زۆر کەیفی هات و بەزووترین کات هاتە شاری مەککە، لەشاری مەککە شەوی بەسەر دادێ و ئیمامی عەلی (رضی الله عنه) بەلایا تێدەپەڕێ، دەبینێ وا لەلای حەرەم دانیشتووە، بەرەو ڕووی دێت و دەڵێ: دەڵێی ئەو پیاوە نامۆیە؟ ئەبوزەر وەڵامی دەداتەوە: بەڵێ، عەلی دەڵێ: وەرە لەگەڵم دەڕۆم هەتا دەگەنە ماڵی عەلی و ئەوشەوە ئەبوزەر لەوێ دەمێنێتەوە.

بەیانی دادێ لەماڵی عەلی دێتە دەرەوە بەدوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەگەڕێ بێ ئەوەی لەکەس بپرسێ لەبارەی ئەو هەتا ئێوارە و شەو دادێ، دووبارە ئیمامی عەلی بەلایەوە تێدەپەڕێ و پێی دەڵێ: ماڵەکەت نەدۆزیەوە؟ دەڵێ: نەخێر، دەڵێ: وەرە لەگەڵم، بەبێ قسەکردن هەندێ دەڕۆن ئینجا ئیمامی عەلی پێی دەڵێ: چ شتێك بۆ ئەم شارەی هێناوی؟ دەڵێ ئەگەر بەکەسی نەڵێی پێتی دەڵێم، عەلی دەڵێ وادەکەم، ئەبوزەر دەڵێ: زانیومە یەکێ لێرە پەیدا بووە و داوای پێغەمبەرایەتی دەکات ویستم چاوم پێ بکەوێ، ئیمامی عەلی دەڵێ: وەرە بەدوام، دەیباتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

ئەبوزەر سڵاو لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات و ئەویش وەڵامی دەداتەوە و پێی دەڵێ: تۆ کێی؟ دەڵێ: ئەبوزەرم لەغەفار، پاشان لەگەڵ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەندێ قسە پێکەوە دەکەن، ئینجا پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی دەڵێ: ئەم کارەت بشارەوە و بگەڕێوە وڵاتی خۆت، بەڵام ئەبوزەر سوور دەبێ لەسەر ئەوەی موسڵمان بوونەکەی خۆی رابگەیەنێ، هەڵدەستێ دەچێتە لای قورەیشییەکان و تا دەنگی تیایە هاوار دەکات: أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله، ئەوانیش دەکەونە سەری و بەهەموو جۆرێك لێی دەدەن، وازی لێ ناهێنن هەتا ئیمامی عەباس هاوار دەکات: دەتانەوێ یەکێك بکوژن کەلەغەفارە لەکاتێکا کاروان و بازرگانیتان بەلای ئەوانەوە رەت دەبێ.

بۆ بەیانی ئەبوزەر دەچێتەوە بەردەمیان و هەمان شتی دوێنێ دەڵێتەوە، ئەوانیش دووبارە تێی بەردەبن و دەکەونەوە لێدانی، ئیمامی عەباسیش بەهەمان قسەکەی دوێنێ لەژێر دەستیان دەردەهێنێ.

پاش ئەوەی لێدان و کوتانێکی زۆری لەدەست قورەیش بەردەکەوێ ئینجا دێتەوە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و لەلای دادەنیشێ پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بۆ ئەوەی لەئازار و ئازاردان دووری بخاتەوە پێی دەڵێ: ئەبوزەر بڕۆوە ناو هۆزەکەی خۆت و بەرەو ئیسلام بانگیان بکە بەڵکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە ڕێنموونییان دەکات و پاداشتی تۆش دەداتەوە.

ئەبوزەر ڕازی دەبێ و دەڵێ: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا ئینجا دەگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی خۆی.

## ٥٨- داعییەکی ئازا

ئەبوذەر چۆن لەموسڵمان بوونەکەی ئازابوو و نەترسا، کەگەڕایەوە ناو میللەتەکەیشی دیسان هەر ئازا بوو لەبانگ کردنیان بەرەو ئیسلام، ئەوەبوو دەستی پێ کرد یەك یەك دوو دوو خەڵکی بەرەو ئەو ئایینە بانگ دەکرد هەتا وای لێ هات زۆربەی زۆری هۆزی غەفاری کردە موسڵمان، لەکۆتاییی دا توانی سەرۆکی هۆزەکە بکاتە موسڵمان.. هەتا لەئەنجامدا قەومەکەی خۆی هەموو کردە موسڵمان.. ئەوەیە سیفەتی ڕاستەقینەی هەموو قوتابییەکی قورئان کەهەرگیز لەبڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام و بانگ کردنی خەڵك و وشیار کردنەوەیان ڕەزیلی ناکەن.

## ٥٩- ئازادی بیروڕا

کەئیمامی عومەر (رضی الله عنه) تازە کرایە خەلیفە، لەبەردەم جەماوەر وتاریکی دا و تیایدا ووتی: ئەی خەڵکینە.. ئەوەی خوار و خێچییەکی لێ بەدی کردم با ڕاستی بکاتەوە یەکێکی ئاسایی لەخەڵکەکە قسەی پێ بڕی و ووتی: وەڵلاهی ئەگەر خوار و خێچییەکت لێ ببینین ئەوا بەزەبری شمشێرەکانمان ڕاستت دەکەینەوە.

بەڵام کەئیمامی عومەر ئەم وەڵامەی بیست حوکمی سێ دارە یان بەند کردنی ئەبەدی بۆ دەرنەکرد، بەڵکو بەپێچەوانەوە ووتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی لەناو موسڵمانان پیاوی وای داناوە کەخوار و خێچی عومەر بەشمشێر ڕاست دەکاتەوە.

## ٦٠- پێشەوا دانانیشێ

جارێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ دەستەیەك لەیارانی بۆ بیابان دەرچوو بوو مەڕێکیشیان لەگەڵ خۆیان برد، یەکێك لەیارەکان ووتی: من سەری دەبڕم، یەکێکی تر ووتی: با کەورکردنەکەشی لەسەر من بێ، هی سێیەمیان ووتی: منیش دەیکەمە چێشت، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: منیش داری سووتان کۆ دەکەمەوە، ووتیان: پێغەمبەری خوا ئێمە دەمانەوێ تۆ بحەسێیەوە.. خۆت ماندوو مەکە ئێمە کارەکان دەکەین.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: بەیەزدانی گەورە من دانانیشم و ئێوەش کار بکەن، خوای گەورە رقی لەوە دەبێتەوە کەبەندە لەسەر بەندەی برای جیاوازی هەبێ.. ئینجا خۆی چوو دارەکانی کۆکردەوە.

## ٦١- موسڵمان لەکونێکا دوو جار مار نایگەزێ

لەجەنگی بەدر موسڵمانەکان ژمارەیەك کار و هاوبەش پەرستیان بەدیل گرت، جا یەکێ لەو بەدیل گیراوانە ئەبو عززە بوو کەشاعیر بوو، ئەبو عززەش وێڕای ئەوەی دژ بەموسڵمانەکان لەجەنگەکە بەشداری کرد، پێش جەنگەکەش هەمیشە بەخراپە لەبارەی پێغەمبەر و موسڵمانەکان دەدوا.

بەڵام هاتە لای پێغەمبەر و پێی ووت: ئەی موحەممەد پێنج کچم هەیە کەس نییە بەخێویان بکا، لەبەر خاتری ئەوان بمبەخشە پەیمانت دەدەمێ ئیتر نەیەمەوە جەنگ لەگەڵتا و کەسیشتان لەسەر هان نەدەم و بەخراپەش باستان نەکەم.. پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) بەزەیی پیا هاتەوە، بەرەڵای کرد.. وەئەو تاکە دیل بوو کەبەبێ تۆڵە بەرەڵا کرا.

بەڵام زۆری پێ نەبوو چۆوە سەر بەزمەکەی خۆی و لەساڵی دوایی دا بەشداری لەجەنگی ئوحدا، بەڵام دووبارە بەدیل گیرا، کەهێنایانە بەردەم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ووتی: ئەی موحەممەد ئەم جارەش لەبەرخاتری کچەکانم بمبەخشە بەڵێنت ئەدەمێ جارێکی تر پەیمان نەشکێنم و ئیشی وا نەکەم، پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: نەء ... بەخوا جارێکی تر ناچیتەوە ناو مەککە و لەوێ لەحوجرە دابنیشی دەستت بەسمێڵەکانتەوە بنێ و بڵێی موحەممەدم هەڵ خەڵەتاند، ئینجا بردیان کوشتیان.

## ٦٢- نیوەی رۆژەکەی کردە سەدەقە

دەگێڕنەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هانی خەڵکەکەی دا لەسەر سەدەقە، ئەوەبوو عبدالرحمانی کوڕی عەوف چل ئۆقیە زێڕی هێنا و بەخشی، وە ووتی: هەشتا ئۆقیەم هەبوو چلم بەقەرز دایە خوای گەورە و چلەکەی تریش بۆ مناڵەکانم هێشتەوە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: بارك الله لەوەی بەخشیت و لەوەی بۆ خۆتانت هێشتەوە.

عاصمی کوڕی عەددەیش سەد باڵە خورمای کردە صەدەقە، ئەبو عەقیلی ئەنصاریش صاعێك[1] خورمای هێنا و ووتی: ئەم شەو هەمووی گوریسم راکێشا بەدوو صاع صاعێکم بۆ مناڵەکانم بەجێ هێشت و ئەوەش صاعەکەی ترە هێناومە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی پێ کرد بچێ لەسەر شتەکانی تر دایبنێ.

---

(١) یەکەیەکی کێشان بوو دەکاتە نزیکەی ١١ رەتل.

ئینجا دووڕووەکان کەهەمیشە پیشەیان ئەوەیە ئاژاوە و ناوکی بچێتە ناو کۆمەڵی موسڵمانان دەستیان بەپرتە و بۆرە کرد و بەگاڵتە دەیانووت: عبدالرحمن و عاصم بەڕیا سەدەقەکەیان بەخشی، خوا و پێغەمبەریش کاریان بەو صاعەی ئەبو عەقیل نییە، بەلاّم خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە و ئەم قسەیەی بەدرۆ خستەوە و لۆمەی کردن.

## ٦٣- دڵی بەپێغەمبەرەوەیە

کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەکۆچ کردوویی گەیشتە شاری مەدینە، طەلحەی کوڕی بەراء کەمناڵێك بوو پێی گەیشت و خۆی بەقاچی ووشترەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا و ماچی دەکرد و دەیووت: ئەی پێغەمبەری خوا هەر فەرمانێکت هەیە بیکە، شەرت بێ هەرچییەکبێ دەبێ جێ بەجێی بکەم، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) سەری لێ سوڕما و پێکەنینی بۆی هات، وەفەرمووی: بڕۆ باوکت بکوژە، طەلحە کەئەمەی بیست یەکسەر رای کرد بچی باوکی بکوژێ، هەروەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) داوای کردبوو، بەلاّم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی کردەوە و پێی ووت: وەرە بۆ ئەوە نەنێردراوم پەتی رەحم بپچڕێنم.

پاش ئەم رووداوە طەلحە نەخۆش دەکەوێ و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) دەچێتە سەردانی، پاشان کەبەجێی هێشت فەرمووی: وابزانم طەلحە دەمرێ، ئەگەر ئەمری خوای بەجێ گەیاند بەخێرا وەرن بانگم بکەن با خۆم نوێژی لەسەر بکەم.

پاشان طەلحە ئەمری خوای بەجێ گەیاند، وەلەسەر مردن ووتی: ئەگەر مردن بمشارنەوە و بانگی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) مەکەن، چونکە من دڵم پێیەوە و دەترسم جوولەکەکان بێن لەوێ زەبرێکی لێ بوەشێنن و بەهۆی منەوە تووشی بەڵایەك ببێ.

ئەوانیش چۆنی ووت وایان کرد و پاشان خەبەری پێغەمبەریان دا (صلى الله عليه وسلم) پێغەمبەر هاتە سەر گۆڕەکەی و خەڵکەکەی ریزکرد و دەستی خۆی بەرز کردەوە و داوای خێری بۆ کرد لەلای خوای گەورە.

## ٦٤- تۆڵە بەتۆڵە

لەساڵی شەشەمی کۆچی کۆمەڵە کەسێك لەهۆزی عورەینە هاتنە میوانداری پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) بوونە موسڵمان.

پاشان لەوێ نەخۆش دەکەون و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمان دەکات لەووشترە چاکەکان یەکێکیان بۆ تەرخان بکەن و لەشیرەکەی بیاندەنێ.

بەڵام ئەوان ناپاك دەرچوون، ئەوەبوو کەتەندروستییان هاتەوە سەرخۆ، خۆیان گەیاندە ووشترەوانەکە و دەست و قاچییان بڕی، وەدرِك و داڵیان لەچاوەکانی چەقاند و ئازاریاندا هەتا مرد، وەلەئاینیش هەڵگەڕانەوە.

پاشان هەواڵەکە گەیشتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش مەفرەزەیەکی بەدوا ناردن و مەفرەزەکە بەدوایاندا چوون، هەندێ نەمابوو ئەوان بگەنە ناوچەکەی خۆیان کەمەفرەزەکە گەیشتە سەریان و هەموویانی گرت.

ئینجا بەفەرمانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەست و قاچیان بڕین و چاویان تەقاندن پاشان بردیان لە (الحره)[1] یان فڕێ دان هەتا مردن، ئەوەش بەپێی ئایەتی: ﴿فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱعۡتَدُواْ عَلَيۡهِ بِمِثۡلِ مَا ٱعۡتَدَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾البقرة: ١٩٤ ئەوەش تاوەکو جارێکی تر کەس نەوێرێ کارێکی ئەوتۆ لەگەڵ موسڵمانان بکات.

## ٦٥- کارێکی مەردانە

عەبدوڵڵای کوڕی ئەنیس بۆ عەبدوڵڵای کوڕی گێڕاویەتییەوە دەڵێ: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بانگی کردم و فەرمووی: زانیومە خالیدی کوڕی سوقیانی هەذەلی خەڵکم لەسەر کۆدەکاتەوە و دەیەوێ شالاوم بێنێتە سەر، وا لە (عرنه)ەیە بڕۆ بیگەیێ و بیکوژە.

دەڵێ: ووتم ئەی پێغەمبەری خوا بۆمی وەسف بکە با بیناسمەوە، فەرمووی لەشی زبرە، وەکەچاوت پێی دەکەوێ شەیتانت وەبیر دێتەوە – واتە زۆر بڵحە–.

عەبدوڵڵا دەڵێ: منیش بەشمشێرەکەمەوە بۆی دەرچووم هەتا لە (عرنه) گەیشتمە سەری لەوکاتەی لەگەڵ کۆمەڵە ئافرەتێك بوو لەماڵێکا، وەکەچاوم پێی کەوت ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەسفی بۆ کردبووم هەموویم لێ بەدی کرد، دەڵێ: ووتم پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) راستی کرد، وەکاتەکەش عەسر بوو لەوە ترسام لەگەڵی بکەمە زۆرە ملێ و نوێژەکەم بچێ، بۆیە هەر

---

[1] شوێنێکە لەدەرەوەی شاری مەدینە و خاکەکەی بریتییە لەبەردی رەش.

لەگەڵ ئەوەی بەرەو ڕووی دەچووم نوێژەکەم کرد و سەرم بۆ سوژدە و ڕکوع دادەبەزاند هەتا گەیشتمە سەری.

کەگەیشتمە لای ووتی: ئەو پیاوە کێیە؟ منیش ووتم: پیاوێکە لەعەرەبەکان بەتۆو بەکۆکردنەوە خەڵکت بۆ سەر ئەو پیاوە (پێغەمبەر)ی زانیوە.

ووتی: بەڵێ‌من و منم وام کردووە.

دەڵێ: منیش هەندێ پیاسەم لەگەڵی کرد و کەبۆم هەڵکەوت بەشمشێرەکەم کەتمە سەری هەتا کوشتم، پاشان هاتمە دەرەوە و گەڕامەوە.

کەگەڕامەوە هاتمە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەمزگەوت، کەچاوی پێم کەوت فەرمووی: سەر و ڕووت دەڵێ: سەرکەوتووە؟ ووتم بەڵێ پێغەمبەری خوا کوشتم، فەرمووی: ڕاستت کرد.

پاشان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەستا و منی لەگەڵ خۆی بردەوە ماڵی خۆیان و دارعەسایەکی دامێ، فەرمووی: ئەوە لەلای خۆت هەڵبگرە ئەی عەبدوڵلای کوڕی ئەنیس، منیش وەرمگرت و هێنامە دەرەوە بۆی لای خەڵك، ووتیان ئەو دار عەسایە چییە؟ ووتم: ئەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێمی بەخشیوە و فەرمانی پێ کردووم هەڵی بگرم، ووتیان: بۆ بگەڕێینەوە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێی بپرسی مەسەلە چییە؟

عەبدوڵلا دەڵێ: منیش گەڕامەوە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و لەبارەی ئەم دارە لێم پرسی فەرمووی: ئەوە نیشانەیە لەنێوان من و تۆ لەڕۆژی دوایی لەوێ ڕۆژێ ئەوانەی دار عەسایان پێیە ژمارەیان کەمترین خەڵکە.

عەبدوڵڵا ئەو دارەی لەگەڵ شمشێرەکەی بەستبۆوە و هەتا مردن پاراستی، وەوەسیەتی کرد ئەگەر مرد لەگەڵی لەناو کفنەکەی دابنێن و لەگەڵی بچێتە ناو قەبرەکەی.

## ٦٦- خۆ بەزل زانی

کیسرا پادشای فارسەکان و یەکێ بوو لەو پادشایە هەرە تاغووتەکانی سەر رووی زەوی، ئەو کیسرایە کەبەهاتنی ئەو پێغەمبەرە نوێیەی زانی (صلی الله علیه وسلم) نامەیەکی بۆ کاربەدەستی خۆی لەیەمەن[1] نارد و تیایدا نووسیبووی: زانیومە کەعەرەبێك داوای پێغەمبەرایەتی دەکات، ئەو عەرەبەش ناوی موحەممەدە، دەمەوێ بەزیندوویی بێ یا بەمردوویی بۆ منی بهێنی.

کاربەدەستی یەمەنیش دوو کەسی نارد ئەو پیاوە بهێنن کەداوای پێغەمبەرایەتی دەکات، دوو کەسەکە هاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مەسەلەکەیان خستەڕوو، ئەویش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: کەبەیانی داهات وەرنە لام.

بۆ بەیانی کەهاتنە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەسەر خۆ پێی فەرموون: بڕۆن بەکاربەدەستەکەتان بڵێن خوای گەورە لەم شەو کیسرای لەناو برد، کوڕەکەی خۆی کوشتی.

---

(1) ئەوکاتە یەمەن سەر بەوڵاتی فارس بوو.

## ٦٧- عومەیری دڵسۆز

عەصمای کچی مەڕوان ئافرەتێکی شاری مەدینە بوو، هەمیشە کافر و دوژمنەکانی ئیسلامی لەسەر دژایەتی کردنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هان دەدا و (صلی الله علیه وسلم) هەمیشە هەواڵی دەدا دووبەرەکی (تفرقه) بخاتە نێو ئەوس و خەزرەج، خۆشی شاعیر بوو، بەهۆنراوەکانی ئازاری پێغەمبەری دەدا (صلی الله علیه وسلم) بەڵام پێغەمبەر ئارامی لەسەر دەگرت و گوێی پێ نەدەدا.

وەلەو کاتەی پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) یارەکانی بۆ جەنگی بەدر دەردەچوون ئەسماء گاڵتەی پێ دەکردن و بەسەر هەڵوێستی قورەیشی هەڵدەبەست، وەپڕوپاگەندەی خراپی بڵاو دەکردەوە بەو مەبەسەتەی وورە و عەزیمەتی موسڵمانەکان دابەزێنێ.

عومەیری خەطەمیش کابرایەکی نابینا بوو لەگەڵ عەصمائیشدا لەیەك بنەماڵە دابوون، عومەیر نەزری لەخۆی گرت ئەگەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەسەلامەتی بگەڕێتەوە مەدینە، دەبێ ئەو عەصماء بکوژێ.

کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و لەموسڵمانەکان لەجەنگەکە گەڕانەوە مەدینە، عومەیر سوور بوو لەسەر بەجێ گەیاندنی نەزرەکە، هەستا شەوێ چووە ناو ماڵی عەصماء ، رووی لەژوورەکەی ئەو کرد و چووە ژوور، عەصمائیش لەو کاتەدا لەگەڵ منداڵەکانی نوستبوون، عومەیر دەستی بەلەشیان داهێنا و عەصمائی دۆزییەوە و شمشێرێکی لەسنگی دا و لەپشتی دەری کرد، پاشان لەماڵەکەی هاتە دەرەوە و پێش نوێژی بەیانی هاتە مزگەوت.

پاش نوێژەکە هەستا ویستی بڕوا، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەماشایەکی کرد و لێی پرسی: کچی مەڕوانت کوشت؟

ووتی: بەڵێ.

فەرمووی: خوا و نێردراوی خوات سەرخست ئەی عومەیر.

ووتی: ئەی نێردراوی خوای دەرهەق ئەو ئافرەتە هیچم لەسەرە.

پاشان پێغەمبەر بەیارەکانی فەرموو: ئەگەر حەزتان کرد یەکێك ببینن خوا و نێردراوی خوای سەرخست، ئەوا تەماشایەکی عومەیری کوڕی عەددەی بکەن.

پاشان کەعومەیر گەڕایەوە نێو خزمەکانی هەستی کرد وا کوڕەکانی عەصمای لەگەڵ کۆمەڵێکی تر دەیشارنەوە، ووتیان: ئەی عومەیر تۆ عەصمائت کوشت؟

ووتی: بەڵێ من کوشتم، ئەگەر رازیش نین هەمووتان وەرنە بەرامبەرم و هیچ لەسەرم پاز مەدەن، بەو زاتە پاکەی گیانی منی بەدەستە وەبەئەوەی ئەو ژنە دەیووت ئێوە ئێستا بڵێن دەبێ بەم شمشێرە بەناوتان بکەوم ئەوجا دەمکوژن یان دەبێ هەمووتان بکوژم.

## ٦٨- ماڵی موسڵمانان

جارێکیان ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) پارچە بڕۆنزێکی بەدەست کوڕە بچووکەکەیەوە دیت کەچ نرخێکی نەبوو، بەڵام لەکوڕەکەی پرسی: کوڕم کێ ئەو پارچە بڕۆنزەی پێ دای؟ کوڕەکە ووتی: بابە کارگێڕی (بیت المال) دایمێ، ئینجا ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) دەستی کوڕەکەی گرت و چوونە لای کارگێڕی

بیت المال و پێی ووت: کێ فەرمانی پێ کردووی ئەو پارچە بڕۆنزە بدەیتە کوڕی عومەر؟

ووتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران گەنجینەکەم بەسەرکردەوە دیتم هەموو زێڕ و زیوە و هیچی بڕۆنزی تیا نەبوو ئەوە نەبێ، ئەوەشم دا بەکوڕەکەی تۆ، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) لەتووڕەیی یا سەروچاوی سوور هەڵگەڕا و ووتی: لەدایکت بچی.. لەماڵە موسڵمانەکان گەڕای هیچ ماڵت نەدیتەوە حەڕام بخوا ماڵی عومەر نەبێ؟ بیگرە بڕۆ لەشوێنی خۆی داینێوە.

## ٦٩- ڕوویەکی ڕاستگۆ

عەبدوڵڵای کوڕی سەلام کەپێش ئیسلام بوونیا جولەکەیەك بوو دەڵێ: کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتە مەدینە تەماشایەکم کرد و یەکسەر ووتم: أشهد أن لا إله إلا الله وأنك محمداً رسول الله.

دەڵێ جوولەکەکان پێیان ووتم: چی پاڵی پێوە نای ئەم قسەیە (شەهادە) بکەی ئەی کوڕی سەلام؟ منیش ووتم: بەو خوایە کەجگە لەو خوایەکی تر نییە ئەو هەرگیز رووی درۆزن نییە.

# ٧٠- بۆ ماڵی دونیا نەهاتووم

شەددادی کوڕی شاهد دەگێڕێتەوە:

پیاوێکی عەرەب هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بڕوای پێ هێنا و بەدوای کەوت، وەبەپێغەمبەری ووت: لەگەڵ تۆ کۆچ دەکەم، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی بەچەند کەسێك لەیارەکان کرد ئاگایان لێ بێ و لەگەڵ خۆیان رایبگرن.

کەجەنگی خەیبەر[١] هاتە پێش و موسڵمانەکان تاڵانێکی[٢] زۆریان دەستکەوت لەجەنگەکە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دابەشی کرد و بەشێکیشی بۆ ئەو دانا و دایە یارەکان و فەرمووی بیدەنێ.

کابرا ووشتری موسڵمانەکانی بردبووە لەوەڕ، کەگەڕایەوە بەشەکەی خۆیان دایێ، ووتی: ئەمە چییە؟ ووتیان: پێغەمبەر ئەو بەشەی بەتۆ داوە، ئەویش وەری گرت و هێنای و هاتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، سڵاوی لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد و ووتی: من بۆ ئەوە بەدوای تۆ نەکەوتووم ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵکو بۆ ئەوە بەدوات کەوتووم تاکو تیرێکم لێرە بەرکەوێ (ئیشارەتێکی بۆ قورگی خۆی کرد) و بمرم، تاکو بچمە بەهەشت، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئەگەر لەگەڵ خوا ڕاست بی خواش بەدڵی تۆ دەکات.

پاشان کەدووبارە جەنگ دەستی پێ کردەوە تیرێك هات بەهەمان شوێنی کابرا کەوت کەئیشارەتی بۆ کردبوو، کەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هاتە

---

(١) جەنگی خەیبەر لەگەڵ جوولەکەکان بوو لەساڵی حەوتی کۆچی ڕووی دا.

(٢) تاڵان (غنیمە) بەو کەلوپەل و شتانە دەوترێ کەهی دوژمنن و لەجەنگ دەستیان بەسەر دەگیرێ..

سەر تەرمەکەی پرسی: ئەو کابرایە، خۆیەتی...؟ ووتیان: بەڵێ ئەوە، فەرمووی: لەگەڵ خوا ڕاستی کرد، خواش بەدڵی ئەوی کرد.

ئینجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) جوببەکەی خۆی بۆ کردە کفن و پاشان بەخۆی نوێژی لەسەر کرد و فەرمووی: (خوایە ئەوە بەندەی تۆیە.. لەڕێگەی تۆ بەکۆچەری هاتە دەرەوە، بەشەهیدی کوژرا منیش لەسەر ئەمە شاهێدم)، پاشان ڕاسپاردەی خاکیان کرد.

## ٧١- سەعد نایەتە خوارەوە

سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص یەکێکە لەوانەی کەزۆر زوو باوەڕیان بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هێنا و دوای کەوتن بوونە موسڵمان، جا کەدایکی زانی سەعدی کوڕی بووەتە موسڵمان، ووتی: شەرت بێ دەبێ نەنان و نەئاو بچێتە دەمم هەتا واز لەموحەممەد نەهێنی، بەم شێوەیە نەنانی خوارد و نەئاوی خواردەوە.

سەعد هەستا چووە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و مەسەلەکەی بۆ باس کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: مرۆڤ لەسەریەتی چاکە لەگەڵ دایکی و باوکی بکات، بەڵام ئەگەر هاتوو فەرمانیان پێ کرد لەقسەی خوای گەورە دەرچێ ئەوا نابێت بەقسەیان بکات، پاشان دایکی کەزانی مانگرتنەکەی سوودی نییە، بەناچاری وازی لێ هێنا.

## ٧٢- ئامەزرۆی شەهیدی

عەمری کوڕی جەموح پیاوێکی شەل بوو.. زۆر شەل، چوار کوڕیشی هەبوو کەوێنەی شێر بوون، لەهەموو جەنگ و ڕووداوەکان لەتەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوون، کەجەنگی ئوحد هاتە پێش ویستیان عەمری باوکیان بەند بکەن و پێیان ووت: تۆ بیانوت هەیە خوای گەورە لۆمەت ناکات.

عەمر چووە خزمەت پێغەمبەر و (صلی الله علیه وسلم) ووتی: پێغەمبەری خوا کوڕەکانم دەیانەوێ بەندم بکەن و نەهێڵن لەگەڵ تۆ بۆ ئەو جەنگە دەربچم، منیش وەڵڵاهی هەموو ئاواتم ئەوەیە بەو قاچە شەلەوە لەبەهەشت بگەڕێم.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێی ووت: هەرچی تۆ بیانووت هەیە و جیهادت لەسەر نییە، وەبەکوڕەکانیشی ووت: ئەوەی لەسەر ئێوەش پێویستە ئەوەیە ڕێی لێ نەگرن، بەڵکو خوای گەورە شەهیدی پێ دەبەخشێ...

ئەوەبوو لەئەنجامدا عەمر لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەرچوو لەجەنگەکەی ئوحد کوژرا، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کەبەلایا تێپەڕی لەوکاتەی لەگۆڕەپانی جەنگەکە بەشەهیدی کەوتبوو فەرمووی: ئەی عەمر وا بەراستی دەتبینم بەو قاچانەت لەبەهەشت دەگەڕێی.

پاشان لەگەڵ یەکێ لەشەهیدەکانی تر کەعەبدوڵڵای کوڕی عەمر کەمێرد خوشکی بوو پێکەوە لەناو گۆڕێکیان شاردنەوە.

بەراستی جوانە، مرۆڤ ئەگەر خۆی بیەوێ تاقی کردنەوەکەی تۆی بەشێوەیەکی باش بدات، ناهێڵێ کەس ڕێگەی لێ بگرێ، هەتا ئەگەر کەم و کورییەکیش لەناو لەشی خۆی هەبێ ئەوا ناهێڵێ ئەم کەم و کوڕییە لەزەخیرە دانان یان تاقی کردنەوە دان بەشێوەی تەواو ڕێگەی لێ بگرێ.

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی نەمری عەمر و ئەوانەی وەکو عەمر تاقیکردنەوەکانی خۆیان بەم شێوەیە کۆتایی پێ دەهێنن.

## ٧٣- رق و کین و حەسوودی

جارێك ئەخنەسی کوڕی شورەیق و ئەبو جەهل گەیشتنە یەك، ئەخنەس ووتی ئەی باوکی حەکەم[1] کەس لێرە نییە و تەنها خۆمانین دەوەرە راستم پێ بڵێ ئایا موحەممەد راستگۆیە کەدەڵێ من پێغەمبەرم یان درۆ دەکات؟ ئەبو جەهل ووتی: وەڵڵاهی لێتی نەشارمەوە موحەممەد راستگۆیە و هەرگیز درۆی نەکردووە، بەڵام ئەگەر نەوەی قوصەی[2] دەست بەسەر سیقایە و حیجابە و بەیداخ و یانەی ئەنجوومەن (دار الندوه) و پێغەمبەرایەتی دابگرن ئەدی ئێمە چیمان بۆ دەمێنێتەوە.

حارث کوڕی عامریش کەئەویش لەنەوەکانی قوصەی بوو لەئاشکرادا پێغەمبەری بەدرۆ دەخستەوە، بەڵام کەبەتەنها لەناو ماڵ و منالی خۆی دەمایەوە دەیووت موحەممەد پیاوی درۆ نییە و من زۆر بەراستگۆی تێ دەگەم.

---

(١) واتە ئەبولحەکەم: ئەوەش ناوێکی تری ئەبو جەهل بوو.

(٢) قوصەی باپیرە گەورەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو.

## ٧٤- نایاندەمە دەست

کەزوڵم و ئازاری قورەیش دەرهەق پێغەمبەر و یارەکانی بەتین بوو لەشاری مەککە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەیارەکانی خۆی فەرموو: بڵاوە بکەن و کۆچ بکەن، ئەوانیش پرسیان، بۆ کوێ بچین؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بڕۆنە حەبەشە لای نەجاشی، پیاوێکی چاکە و زوڵم لەکەس ناکات.

کۆمەڵێك لەیارەکانی پێغەمبەر، هەندێکیان بەتەنیا و هەندێکیش لەگەڵ خێزانەکەی خۆی مەککەیان بەجێ هێشت و بۆ حەبەش کۆچیان کرد بۆ ئەوە لەوێ بتوانن بەسەربەستی ئایینەکەی خۆیان بەڕێوە ببەن، ژمارەشیان یازدە پیاو و چوار ئافرەت بوو، لەوێش نەجاشی ڕێزی لێ گرتن و بەخۆشی دەژیان.

ئەوە لەحەبەشە، بەڵام لەمەککە کافرەکان ئەوەندەی نەمابوو لەتاوا بتۆقن، ئەوەش لەترسی ئەوەی نەوەك ئایینەکەی بەجیهان بڵاو ببێتەوە، بۆیە هەستا عەمری کوڕی عاص (پێش موسڵمان بوونی) وە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەبیعەیان ناردە لای نەجاشی، کەلوپەلی ڕازاوە و دیاریەکی زۆریشیان لەگەڵ ناردن بۆ ئەوە بیدەنە نەجاشی و قەشەکانی وەپێیان ووتن: پێش ئەوە هیچ قسەیەك لەگەڵ نەجاشی بکەن بۆ هەر قەشەیەك لەقەشەکانی دیارییەك ببەن.

ئەو دوو نێردراوەی کافرەکان هاتنە لای نەجاشی و داوایان لێ کرد موسڵمانەکانیان بداتە دەست، بەڵام نەجاشی ووتی: هەتا پێشتر قسەیان لەگەڵ نەکەم نایاندەمە دەست.

پاشان کۆچەرەکانیان هێنا و جەعفەری کوڕی ئەبو تالیب ووتەیەکی دا تیایدا هەندێ باسی بێ نرخی و چرووکی گومڕایی و ژیانی نەفامی کرد، وەئایا ئایینی

ئیسلام چۆن بەرزی کردنەوە و لەم نەفامییە رزگاری کردن و رەوشتی پیرۆزی پێ بەخشیوون.

پاشان نەجاشی داوای لەجەعفەر کرد هەندێکی لەو ئایەتانە بخوێننەوە کەلەقورئاندا هاتووە، جەعفەریش لەسوورەتی (مەریم) هەندێکی لەو ئایەتانە بۆ خوێندەوە کەباسی حەزرەتی عیسا دەکات.

کەنەجاشی و قەشەکان گوێیان لەئایەتەکان بوو دەستیان کرد بەگریان بەشێوەیەك ریشەکانیان هەموو تەڕ بوو، وەنەجاشی ووتی: ئەوەی ئەوانە باسی دەکەن لەگەڵ ئەوەی عیسا هێناویەتی لەیەك سەرچاوە هەڵدەقوڵێن.

پاشان ووتی بەدوو نێردراوەکەی قورەیش: بڕۆن لێرە بەخوا هەرگیز تەسلیمیان ناکەم و بەپیاوەکانی خۆی ووت: بێنن دیارییەکانیشیان بدەنەوە، پێویستم بەو دیارییانە نییە.

## ٧٥- ئەبوبەکر لەدەمی گەورەیەکی جوولەکە دەدات

جارێکیان ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) بەلای کۆمەڵە جوولەکەیەکدا تێپەڕی کەلەچواردەوری فینحاص کۆببونەوە، فینحاس گەورەی جوولەکەکانی بەنی قەینوقاع و گەورەی زانا و قەشەکانیشیان بوو.

ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) چووە لای پێی ووت: ئەی فینحاس لەخوا بترسە وەرە ببە موسڵمان و قەرزێکی باش بدەرە خوای گەورە بەخوا زۆر باش دەزانی موحەممەد نێردراوی خوایە و ئەم شتە لەتەوراتیشدا نووسراوە.

فینحاص ووتی: وەڵڵاهی ئەبوبەکر ئێمە وەك خوا هەژار نین، خوا هەژارە، وەئێمە دەستی بۆ پان ناکەینەوە وەك ئەوەی ئەو دەست بۆ ئێمە پان

دەکاتەوە، وەئێمە دەوڵەمەندین بەڵام ئەو دەوڵەمەند نییە، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە پارە و ماڵی لەئێمە قەرز نەدەکرد، وەموحەممەد بەئێمە دەڵێ: سوو (ریبا) مەخۆن کەچی خوا سوو دەخوا، جا ئەگەر دەوڵەمەند بوایە ئەوا سووی بەئێمە نەدەدا.

کەئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) ئەم قسانەی بیست زۆر تووڕە بوو و هەتا گرتی مستێکی لەسەروچاوی کوتا ووتی: بەو زاتەی گیانی منی بەدەستەوەیە ئەگەر ئەو پەیمانەی لەنێوانماندا هەیە نەبوایە بەشمشێر لەملتم دەدا و لێرە تەواوم دەکردی.

فینحاص هەستا چووە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و ووتی: ئەی موحەممەد تەماشاکە بزانە هاوڕێیەکەت چی لێ کردووم، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەئەبوبەکری ووت: چی پاڵی پێوەنای ئەم کارە بکەیت؟

ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) ووتی: ئەی نێردراوی خوا ئەو دوژمنەی خوا قسەیەکی زۆر گەورەی کرد.. ئەو دەیووت: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین کەئەمەی ووت منیش لێی تووڕە بووم و لێم دا، فینحاص ووتی: شتی وام نەوتوە، لێرەدا خوای گەورە ئایەتی ناردە خوارەوە و قسەی فینحاصی بەدرۆ خستەوە، ئایەتەکەش ئەوەبوو: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ۘ سَنَكْتُبُ مَا قَالُوا۟ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾ آل عمران: ١٨١ .

## ٧٦- خەلیفە پارە قەرز دەکات

جارێك ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ناردییە لای عبدالرحمنی کوڕی عەوف (٤٠٠) درهەمی بەقەرز بداتی، عبدالرحمن هاتە لای و پێی ووت: پارە لەمن قەرز دەکەیت لەکاتێکا (بیت المال)ت لەلایە، بۆ لەوێ نابەی و پاشان دایبنێیەوە؟

ئیمامی عومەر ووتی دەترسم لەو ماوەیەدا بمرم و ئەوجا ئەوکاتە تۆ و هاوەڵەکانت بڵێن: دەلێی گەڕێن با ئەوەندە بۆ ئەمیری موسڵمانان بێ، بەوەش لەرۆژی قیامەت لەزەخیرەکەم کەم دەکرێتەوە بەڵام ئێستا کەلەتۆ قەرز دەکەم ئەوا ئەگەر سبەی بشمرم تۆ دێی لەمیراتەکەم هەڵی دەگریەوە.

## ٧٧- کەس ئاگای لەکەس نامێنێ

جارێك قوتابی قورئان و خێزانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عائیشە (خوا لێی رازی بێ) دەگریا، پێغەمبەریش فەرمووی: بۆچی دەگری؟ عائیشە ووتی: باسی ئاگرت کرد و منیش گریانم هات، ئایا لەرۆژی قیامەت ئەهلی خۆتان بەبیر دێتەوە؟

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: لەوێ رۆژێ لەسێ جێگادا کەس کەسی لەبیر نامێنێ، لەکاتی دابەش کردنی دەفتەری کردەوەکان هەتا پیاو نەزانێ ئایا بەدەستی راستی دەیدرێتێ یان بەدەستی چەپ، لەکاتی دانانی تەرازوو هەتا پیاو نەزانێ ئایا تەرازووەکەی گران دەکێشێ یان سووك، سێیەمیش لەوکاتەی لەسەر پردی صیراتن هەتا دەزانێ بەسەر رەت دەبێ یان دەکەوێ.

## ٧٨- هەڵوێستی جوان

دەگێڕنەوە جارێك كابرایەك كەناوی (ثەمامەی كوڕی ئەثال) بوو، شیرەكەی هەڵگرت و لەهۆزی یەمامە هاتە دەرەوە بەرەو شاری مەدینە هات وەشمشێرەكەی تیژ كردبوو هەموو نیازی ئەوەبوو بچێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بكوژێ.

كەهاتە ناو شاری مەدینە شمشێرەكەی بەدەستەوە گرتبوو، ئیمامی عومەریش (رضی الله عنه) لەناو شار بەو دیمەنە چاو پێ كەوێ، جا ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) خۆی زۆر زیرەك و دووربین بوو، بۆیە هەڵی دایە لا و لێی پرسی: چ شتێك تۆی هێناوەتە شاری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەكاتێكا تۆ هاوبەش پەرستی؟ ثمامە ووتی: عومەر وازم لێ بێنە هاتوومە موحەممەد بكوژم، ئیمامی عومەریش (رضی الله عنه) شمشێرەكەی لێ سەند و قۆڵ بەستی كرد، پاشان بردی لەیەكێك لەكۆڵەگەكانی مزگەوت بەستییەوە، ئینجا چووە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مەسەلەكەی عەرز كرد تا بزانێ ئەو چی بڕیار دەدا.

بێگومان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەیتوانی بەیەك ووشە بڵێتە عومەر بڕۆ لەملی بدە و مەسەلەكە دەبڕایەوە، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) قسەی نەكرد و لەگەڵ عومەر (رضی الله عنه) لەماڵەوە هاتە دەرەوە و بۆ مزگەوت چوون، تاكو بزانێ ئەوە كێیە هاتووە بیكوژێ، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەماشایەكی كابرای كرد كەدەست و پێوەند كراوە و بەكۆڵگەكە بەسترابۆوە، لەولاش ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) شمشێری كابرای

بەدەستەوە بوو و چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد ئێستا نا ئێستا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمان بدا لەملی کابرا بدەن و ئەویش بەچاوقوچانێك ملی بپەڕێنێ.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەماشایەکی یارەکانی خۆی کرد کەلەدەوری وەستابوون و پرسی: هیچ خۆراکێکتان بۆ ئامادە نەکردووە؟ عومەر وەڵامی پێ نەدراوە چونکە ئەو دەیویست کابرا بکوژێ وەووتی: ئەی پێغەمبەری خوا خۆراکی چی؟ ئەوە بۆ خۆراك نەهاتووە، بەڵام پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بڕۆن لەماڵی ئێمە هەندێ شیری بۆ بێنن ئەوانیش هەندێك شیریان بۆ هێنا، ئەوجا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا کابرا بکەنەوە، ئیمامی عومەریش لەداخی کابرا ئاگری تێبەر دەبوو.

پاشان کەکابرا شیرەکەی خواردەوە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: بڵێ لا إله إلا الله، کابرا ووتی نایڵێم، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی بڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله، کابرا ووتی: نایڵێم، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمانی دا دەست بەجێ بەرەڵای بکەن و وازی لێ بێنن کابرا لەمزگەوت هاتە دەرەوە و بەرەو وڵاتی خۆی بگەڕێتەوە، بەڵام هێشتا هەندە لەمزگەوت دوور نەکەتبوو کەدووبارە گەڕایەوە مزگەوت و بەپێغەمبەری ووت: پێغەمبەری خوا أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پێی فەرموو: باشە ئەدی یەکەمجار کەداوام لێ کردی بۆ نەت ووت؟ ئەمامە ووتی: چونکە ئەوکاتی من لەژێر دەستی تۆ بووم، بۆیە لەوە دەترسام پێم بووترێ لەترسان و بەزەبری شمشێر بووەتە موسڵمان، ئەوەبوو کەبەرەڵات کردم بوومە موسڵمان بۆ ئەوەی رەزامەندی خوای گەورە وەربگرم، شایەنی باسە ئەم کابرایە دەی ووت، کەیەکەم جار هاتمە

مەدینە پیاو نەبوو لەمحەممەد زیاتر ڕقم لێی بێتەوە، کەبەجێم هێشت پیاو لەسەر هەموو ڕووی زەوی نەبوو خۆشەویسترین بێ لەلای من لەپێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) ئەوەیە کاری هەڵوێستی نەرم لەسەر ڕاکێشانی خەڵك، ئەوەیە کاری لێ بووردن لەسەر وەدی هێنانی خۆشەویستی.

## ٧٩- چوار گازاندە

ئیمامی عومەر (رضی اللە عنە) لەسەردەمی خیلافەتی خۆی سەعدی کوڕی عامری کردە کاربەدەستی حەمص[1]. جا کەئیمامی عومەر سەفەرێکی بۆ شارەکە کرد بەخەڵکەکەی ووت: ئەی خەڵکی حەمص کاربەدەستەکەتان چۆنە؟

ئەوانیش گلەییان لێ کرد و ووتیان: لەچوار شت لێی ڕازی نین، ووتی: ئەو چوار شتە چین؟ ووتیان: هەتا ڕۆژ هەڵنێت بۆمان نایەتە دەرەوە، وەبەشەو کارمان جێ بەجێ ناکات، وەمانگی ڕۆژێك نایەتە دەرەوە، وەهەرچەند ڕۆژەی جارێك دادەمێنێ.

ئیمامی عومەریش سەعید و خەڵکەکەی پێکەوە کۆکردەوە، بەخەڵکەکەی ووت: چ گلەیی لێ دەکەن؟ ووتیان: هەتا ڕۆژ هەڵنێ بۆمان نایەتە دەرەوە، ئیمامی عومەر پێی ووت: چی دەڵێی؟ سەعید ووتی: وەڵڵاهی هەرچەند حەزیش ناکەم باسی بکەم بەڵام لەماڵەوە کەسمان نییە کارمان بۆ بکا، بۆیە دەبێ خۆم هەویر ئامادە بکەم و پاشان هەر خۆم بیکەمە نان پاشان دەست نوێژ هەڵدەگرم و دێمە دەرەوە، ئەوکاتەش ڕۆژ هەڵدێ.

---

(1) حەمص: شارێکە لەسووریا.

ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ووتی: چی تر؟ ووتیان بەشەو کارمان جێ بەجێ ناکات، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) پێی ووت: چی دەڵێی؟ ووتی: وەڵلاهی هەرچەندە حەزیش ناکەم باسی بکەم بەڵام رۆژم بۆ خەڵکەکە تەرخان کردووە شەویش بۆ خوای گەورە.

ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ووتی: چی تر؟ ووتیان: لەهەر مانگێ رۆژێك نایەتە دەرەوە، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) پێی ووت: چی دەڵێی؟ ووتی: کەسم نییە جلم بۆ بشوا، وەجلی زیادیشم نییە لەبەری بکەم، بۆیە کەدەیشۆم دەبێ لەماڵەوە بم تا ووشك دەبێتەوە.

ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ووتی: چی تر؟ ووتیان: هەرچەند رۆژێ جارێك دادەمێنێ، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) پێی ووت: لەوە چی دەڵێی سەعید ووتی: ئەوکاتەی خوبەیبی کوڕی عەددەیان کوشت و لەخاچیان گرت من لەوێ بووم، پێیان ووت: ئایا حەز دەکەی تۆ لەناو ماڵ و منداڵی خۆت بوای و موحەممەد لەجێگەی تۆ بوایە؟ خوبەیب ووتی: وەڵلاهی حەز ناکەم من لەناو ماڵ و منداڵی خۆم بم ئەگەر یەك دڕك لەقاچی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رابچێ، پاشان هاواری کرد: ئەی موحەممەد هەر جارێك ئەو دیمەنەم بەبیر دێتەوە کەلەوکاتەدا هاوبەش پەرست بووم و فریای خوبەیب نەکەوتم وادەزانم خوای گەورە هەرگیز لێم خۆش نابێ، جا هەر جارێك کەئەوەم بەبیر دا دەمێنم.

ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) سوپاسی خوای گەورەی کرد و پاشان هەزار دیناری بۆ نارد و پێی ووت: کاری خۆتی پێ هەڵسوڕێنە، بەڵام ئەو ووردی کردەوە و بەسەر هەژار و دەست کورتەکانی دابەش کرد.. تەنها بڕێکی کەم نەبێ کەپێی ووت: خەرجی بکە.

## ٨٠- ئەگەر سەرکردە موسڵمان بێ

دیسان جارێك ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) بۆ خەڵکی شاری (حەمص)ی نارد تاکو ناوی هەژارەکانی بۆ بنووسن، کەلیستی ناوەکەیان هاتەوە یەکەم ناو ناوی سەعیدی کوڕی عامری کاربەدەستەکەیان بوو.

ئەوەیە حاڵی کاربەدەستێك کەلەباوەشی قورئان پەروەردە بووبێ، ئەوەیە حاڵی کاربەدەستێك کەقوتابی قورئان بێ، بەڵام ئەو پرسیارەی لێرە خۆی دەردەخات ئەوەیە کەئایا کاربەدەستەکانی دەرەوەی ڕێی خوا هەمان چەشنی سەعیدی کوڕی عامرن.

## ٨١- قورئان بەرنامەی ئێمەیە

جارێك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پەڕێکی تەوراتی بەدەستی عومەری کوڕی خەتابەوە دیت، لێی پرسی: ئەوە چییە ئەی عومەر؟ ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ووتی: پەڕێکی تەوراتە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تووڕە بوو و فەرمووی: ئایا ئێوەش وەکو جوو و گاورەکان دوو دڵن لەئاینەکەتان.. من ئەو ئایینەم بەپاکی بۆ ئێوە هێناوە، وەڵڵاهی ئێستا موسای برام زیندوو بوایە دەبوایە ئەویش بەدوای من بکەوتایە.

## ٨٢- خۆشەویستی سەرکردە

لەجەنگی بەدر لەوکاتەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) خۆی ریزی یارە جەنگاوەرەکانی رێك دەخست، دیتی وا سەوادی کوڕی عەزیە لەریزەکە نەختێك هاتۆتە دەرەوە و بەتەواوی ریز نەبووە، ئەویش (صلى الله عليه وسلم) تیرێکی بەدەستەوە بوو و سکی سەوادی پێ پاڵ دا و فەرمووی: ئەی سواد برۆ ناو ریز.

سەوادیش ووتی: پێغەمبەری خوا ئازارت دام، لەکاتێکا خوای گەورە تۆی بۆ هەق و دادوەری ناردووە، تۆڵەم بدەوە.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) سکی خۆی بۆ دەرخست و فەرمووی: تۆڵەی خۆت وەربگرەوە، سەوادیش پێغەمبەری گرتە باوەشی خۆی و سکی ماچ کرد.

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەی سەواد چی پاڵی پێوەنای بۆ ئەم کارەت؟ ووتی: هەروەك دەبینی وا لەجەنگ داین بۆیە ویستم دوا بەسەرهاتم لەگەڵ تۆ ئەوە بێ پێستم بەپێستت بکەوێ.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) دوعای خێری بۆ کرد.

## ٨٣- لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر لانادەین

هەروەك لەبەشی یەكەمی ئەم نامیلكەیە زانیمان كەپاش مردنی پێغەمبەری پێشەوا (صلی الله علیه وسلم) چەند هۆز و تیرەیەكی عەرەبەكان لەئیسلام هەڵگەڕانەوە و هەندێكیان لەوانە بەرەو پایتەخت (مەدینە) كشان بۆ ئەوە داگیر و تالآنی بكەن.

جا پێش ئەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) كۆچ بكات سووپایەكی بۆ دەرەوە ناردبوو بەسەركردایەتی ئوسامەی كوڕی زەیدی كوڕی حاریثە.

هەندێك لەسەحابەكان هاتنە لای ئیمامی ئەبوبەكر (رضی الله عنه) و داوایان لێ كرد فەرمان بدا سوپایەكە بگەڕێنێتەوە شاری مەدینە، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) سوورترین سەحابە بوو لەسەر گەڕاندنەوەی سوپایەكە و لەم ڕووەوە زۆر ئیلحاحی لەئیمامی ئەبوبەكر (رضی الله عنه) كرد.

ئیمامی ئەبوبەكر (رضی الله عنه) هاواری كرد: (ویحك).. ئەی عومەر دەتەوێ یەكەم كارم ئەوە بێ گرێیەك بكەمەوە كەپێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەدەستی خۆی لێی دابێ؟! وەڵڵاهی ئەو سوپایەی ئوسامە ناگەڕێنمەوە هەتا ئەگەر هاتوو بەچاوی خۆم ببینم سەگ قاچی موسڵمانان لەكۆڵانەكەی مەدینە ڕادەكێشێ..

یارەكانی پێغەمبەر.. قوتابییەكانی قورئان هەرگیز سوور بوینە لەسەر گرتنی ڕێباز و ڕێچكەی پێغەمبەر و هەرگیز لەم ڕێبازەی ئەو لایان نەداوە.. چونكە ئەوان لەئێمە زۆر باشتر دەیانزانی كەتەنها ڕێگەكەی ئەو ڕێگەی قوتاربوونە لەئاگری جەهەننەم، وەدەیانزای هەر شتێك ئەو كردبی هاتنە خوارەوەی بۆ نییە.

## ٨٤- ئەو ڕێیە هەموو شتێکی دەوێ

ئەبو طەلحەی ئەنصاری (زەیدی کوڕی سەهل) دەوڵەمەندترینی ئەنصاریەکان بوو لەدارخورما، وە (بیرحاء) خۆشەویسترین ماڵی بوو کەبریتی بوو لەباغێك و کەوتبووە بەرامبەر مزگەوت و هەموو جارێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەچووە ناوی و لەژێر سێبەری دارەکانی و لەئاوەکەی دەخواردەوە.

جا کەئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾آل عمران: ٩٢ [1]، ئەبو طەلحە بەپێغەمبەری (صلی الله علیه وسلم) ووت: ئەی پێغەمبەری خوا خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ وەخۆشەویسترینی ماڵم (بیرحاء)ە ئەوە کردمە سەدەقە با بۆم ببێتە زەخیرە لەلای خوای گەورە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بەخ.. بەخ..[2] بەراستی ئەو ماڵە ماڵێکی قازانج بەخشە.. خۆ گوێت لێ بوو چیمان ووت ئەی ئەبو طەلحە.. وەئەوە لێمان وەرگرتی و پێتی دەدەینەوە، من وا دەبینم بۆ خزم و نزیکەکانت دایبنێ.

ئەبو طەلحە ووتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا.

پاشان بەسەر خزم و ئامۆزایەکانی دابەشی کرد.. وەبەشێکی دا بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەپێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بەشەکەی خۆی دا بەحەسەنی کوڕی ثابتی شاعیری خۆی..

---

(1) واتە: کاری چاکتان بۆ نانووسرێ هەتا خۆشەویسترینی ئەو شتانەی هەتانە لەپێناوی خوا نەیبەخشن.

(2) ووشەیەکە لەزمانی عەرەبی بۆ سەرسوڕمان بەکاردێت.

## ٨٥- ئافرەتێکی موسڵمان

پاش ڕزگارکردنی شاری مەککە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بۆ جەنگی حونەین دەچوو.

جا لەم جەنگەی حونەین ئەبو طەلحەی ئەنصاری لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆی گرتبوو، وەتەنها خۆی بیست هاوبەش پەرستی کوشتبوو، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەبارەی ئەو طەلحە و ئەوکارەی ڕۆژی حونەین کردی فەرمووی: ئەبو طەلحە شێرێکە لەشێرەکانی خوا.

خێزانەکەی ئەبو طەلحە (ئوم سەلیم) لەجەنگەکە لەگەڵ ئەبو طەلحە بوو لەوکاتدا سکی هەبوو، جا لەکاتی جەنگەکەدا سکی خۆی توون بەستبوو بەدەستێکی پەتی ووشترەکەی ئەبو طەلحەی گرتبوو و بەدەستەکەی تریشی خەنجەرێکی هەڵگرتبوو.

کەئەبو طەلحە چاوی پێ کەوت پێی ووت: جا ئوم سەلیم ئەو خەنجەرە چییە بەدەستەوەیە؟ ئوم سەلیم ووتی: ئەگەر هاوبەشپەرستێك لەپێغەمبەری خوا نزیك کەوتەوە ئەوا بەو خەنجەرە سکی هەڵدەبڕم، ئەبو طەلحە بەپێغەمبەری ووت: پێغەمبەری خوا گوێت لێ نییە ئوم سەلیم چی دەڵێ؟

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) پێکەنی و دوعای خێری بۆ کرد.

## ٨٦- شوانە قولە رەشەکە

لەجەنگی خەیبەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) گەمارۆی هەندێ لەقەلاّی جوولەکەکانی دابوو، لەوکاتەدا پیاوێك کەکۆمەڵە مەڕێکی پێ بوو، دەیلەوەڕاند هاتە لای ئەو پیاوە ناوی یاسر بوو لەلای پیاوێکی جوولەکە شوانی دەکرد.. ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ ئیسلام بانگم بکە.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) داوای لێ کرد ببێتە موسڵمان، کابراش بووە موسڵمان و ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من کابرایەکی رەشم، رەنگم ناشرینە ئەوەی ناوی ماڵە نیمە، ئایا ئەگەر هەتا دەکوژرێم لەگەڵ ئەوانە جەنگام، دەچمە بەهەشت؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: بەڵێ.

ووتی: دەنا من لەلای خاوەنی ئەو ماڵاتە بەکرێ کار دەکەم، وەئەو ماڵاتە لەلای من ئەمانەتە چییان لێ بکەم؟ فەرمووی هەندێ خۆڵیان بەروودا بکە و بۆ لای خاوەنەکەیان دەگەڕێنەوە.

کابرای شوان هەندێ خۆڵی هەڵگرت و بەرووی برژاندن ووتی: بۆ خاوەنەکەتان بگەڕێنەوە.. وەڵڵاهی ئیتر لەگەڵ ئێوە کارم نەما، ئینجا مەڕ و ماڵاتەکە هەموو پێکەوە هەروەك یەکێك لەسەریانا بێت ئاوا رۆیشتن و چوونە ناو یەکێك لەقەلاّیەکان.

کەشەڕ دەستی پێ کرد کابرا لەگەڵ موسڵمانەکانی تر هێرشی بردە سەر قەلاّیەك، ئەوەبوو بەردێکی پێ کەوت و کوژرا.

پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) کەبەکوژراوەیی دیتی تەماشایەکی کرد و پاشان رووی لێ وەرگێڕا، ووتیان: پێغەمبەری خوا بۆچی رووت لێ وەرگێڕا؟

فەرمووی: دوو خێزانە حۆرییەکانی لەگەڵ بوون، پاشان دوعای بۆ کرد و فەرمووی: (ڕووت شیرین و بۆنت خۆش بوو و پارەت زۆر بوو).

شایانی باسە کابرا تەنانەت یەك نوێژێك چییە نەیکردبوو.

## ٨٧- چاو بەچاو دەکەویتەوە

یەکەم کەسێ کەقورئانی بەئاشکرا خوێند بێ پاش پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) عەبدوڵلای کوڕی مەسعود بوو، ڕۆژێکیان سەری کوفر هاوبەشپەرست (ئەبو جەهل) کۆمەڵە خەڵکێك دەبینێ بازنەیەکیان پێکهێناوە و دەورەیان لەکابرایەکی لاشە بچووك و لاواز داوە.. کەزیاتر تێی ڕوانی دیتی عەبدوڵلای کوڕی مەسعودە و قورئان بۆ خەڵکەکە دەخوێنێ.

ئەبوجەهل بەمە هەڵدەچێ و شالاو بۆ سەر عەبدوڵلا دەبات، بەکەوانەکەی سەری دەشکێنێ و بەرق و کینێکی زۆرەوە پێی دەڵێ: وەیل بۆ تۆ ئەی کوڕی (ئوم عەبد).. ئێستاش لەپیسکردنی لایەنگر و کۆیلەکاندا بەردەوامی؟ ئەگەر واز نەهێنی چ کارێکی خراپە پێتی دەکەم، عەبدوڵلا بەدوا پلەی ئازایەتی و مەردایەتی مستێکی لەسنگ و چەپۆکی لەرووی ئەدا ئەبو جەهل دەقیرێنێ: ئەوەت لەسەر ناچێ مەڕە شوان، عەبدوڵلا وەڵامی ئەداتەوە: تۆش ئەو کارەت لەسەر ناچێ کەکردت ئەی دوژمنی خوا.

پاشان ڕەورەوەی ڕۆژگار هات و ڕۆیشت جەنگی بەدر ڕوویدا.. ئەو جەنگەی تیایدا زۆر کەللە سەری سەرکردەکانی کوفر کەوتە سەر ئەرز لەمەیدانی جەنگدا.. وەلەو ڕۆژە لابەلایەدا عەبدوڵلای کوڕی مەسعود لەناو کوژراوەکان دەگەڕا چاوی

بەئەبو جەهل کەوت کەلەناو کوژراوەکان کەوتبوو، بەلاّم هێشتا گیانی لەبەردا مابوو.

عەبدوڵڵا قاچی لەسەر ملی دانا و پێی ووت: خوا رسوای کردی ئەی دوژمنی خوا؟ ئەبو جەهل ووتی: ئەوە تۆی ئەی مەڕە شوان.. گەیشتییە شوێنێکی بەرز، عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ووتی: خوا رسوای کردی.. ئەوە سزای دنیاتە، سزای قیامەتیش زۆر لەوە توند و بەتین و تیژترە. پاشان بەشمشێر کەوتە سەر کەللەی سەری و تەواوی کرد.

## ٨٨- پێوەری پایەبەرزی

کەئیمامی عومەر (رضی الله عنه) خەلیفەی موسڵمانان بوو، رۆژێك سەلمانی فارسی و بیلالی حەبەشی و ئەبو سوفیان دەیانەوێ بچنە لای و چاویان پێی بکەوێ.

یەکێ چووە لای و پێی ووت: ئەمیری ئیمانداران ئەبو سوفیان و سەلمان و بیلال لەدەرەوەن دەیانەوێ بێنە خزمەتت، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) خۆی لێ تووڕە کرد و ووتی: وا مەڵێ بەڵکو بڵێ سەلمان و بیلال و ئەبو سوفیان لەدەرەوەن و دەیانەوێ بێنە لات.

ئینجا رێگەی سەلمانی دا بێتە ژوورەوە، پاشان بیلال، ئینجا لەدواجاردا ئەبو سوفیان.

کەئەبو سوفیان ئەمەی دیت تووڕە بوو، بەلاّم پێش ئەوەی گلەیی بکا، ئیمامی عومەر تووڕە بوونەکەی ئەوی بەدی کرد و ووتی: دەزانم پێت ناخۆش بوو سەلمان و بیلالم پێش تۆ هێنا ژوورەوە بەلاّم ئەوان پێش تۆ بووینە موسڵمان، لەتۆ زیاتر خزمەتی ئیسلامیان کردووە، لەبەرئەوە پێش تۆ دێنە لای من، وەپێش تۆ دەچنە بەهەشت، وەپێش تۆ چاویان بەخوای گەورە دەکەوێ.

# ٨٩- عومەر.. عومەر

رۆژێك لەرۆژانی هەینی ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) بەسەر مینبەر کەوت بۆ ئەوەی ووتاری هەینی بۆ موسڵمانەکان بدا، لەو کاتیشدا سوپایەکی ئیسلامی بەسەرکردایەتی (ساریەی کوڕی حصن) لەولاتی فارسەکان لەجەنگدا بوو، ئیمامی عومەر دەستی کرد بەووتارەکە، بەڵام لەپڕێکا ووتارەکەی بڕی و بەهەموو دەنگی هاواری کرد: ئەی ساریە چیایەکە.. چیایەکە.

ئینجا ئەمەی ووت گەڕایەوە سەر ووتارەکەی خۆی، پاش ئەوەی ووتار و نوێژی هەینی تەواو بوو ئیمامی علی (رضی الله عنه) دەگاتە ئیمامی عومەر و پێی دەڵێ: ئەمیری ئیمانداران ئەوە تۆ چیت دەووت!... گوێمان لێ بوو بانگی ساریەت دەکرد، کەچی تۆ باش دەزانی ساریە ئێستا وا لەوێ لەووڵاتی فارسەکانە، ئیمامی عومەر پێی ووت: ئەی عەلی دیتم وا دوژمن دەیەوێ موسڵمانەکان گەمارۆ بدات، ئەوەبوو بانگی سەرکردەکەیانم کرد خۆیان بگەیەننە سەر چیایەکە تاکو خوای گەورە لەدوژمن بیانپارێزێ.

پاشان رۆژهەڵات و رۆژ رۆیی ساریە بۆ شاری مەدینە گەڕایەوە یارەکان بەبێ ئەوەی بەسەرهاتەکەی ئیمامی عومەری بۆ بگێڕنەوە لێیان پرسی چ روویدا لەجەنگەکە؟ ساریە ووتی: لەوکاتەی ئێمە لەگۆڕەپانی جەنگ بووین دوژمن هەوالّی دا لەچواردەورەمان بسوڕێتەوە و گەمارۆمان بدا، منیش لەوکاتە گوێم لەدەنگێکی وەك دەنگی ئەمیری ئیمانداران عومەر بوو بانگی کردم: ئەی ساریە چیایەکە.. چیایەکە، ئێمەش چووینە سەر چیایەکە و خوای گەورە قوتاری کردین.



# ٩٠- دادی ئیسلام

لەسەردەمی خیلافەتی ئیمامی عومەر (رضی الله عنه)، هاوەڵی ناوداری پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبو موسای ئەشعەری (رضی الله عنه) کاربەدەستی شاری کوفە بوو.

ڕۆژێك لەیەکێك لەرەعیەکانی تووڕە دەبێ، بیست قامچی لێ دەدا و سەری دەتاشێ، کابراش هەڵدەستێ دێتە مەدینە و لەلای ئیمامی عومەر شکاتی لێ دەکا، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) دەڵێ: (ئەگەر خەڵك هەموو وەکو ئەو کابرایە بێ گرێ و پەنا قسەیان بکردایە لام خۆشترە لەهەموو ئەو شتانەی کەخوای گەورە پێی بەخشیوم).

پاشان نامەیەك بۆ ئەبو موسا دەنێرێ و تیایدا دەنووسێ: السلام علیکم، پاش سڵاو، فلانی کوڕی فلان ئاگاداری کردوومەوە لەو کارەی کردووتە، جا ئەگەر ئەم کارەت لەبەردەمی خەڵك کردووە ئەوا لەبەردەمی خەڵکی بۆی دابنیشە و با تۆڵەی خۆییت لێ وەربگرێتەوە، ئەگەریش بەتەنها کردووتە ئەوا بەتەنها بۆی دابنیشە و با تۆڵەی خۆییت لێ وەربگرێتەوە.

ئینجا کەکابرا هاتە لای ئەبو موسا (رضی الله عنه) بۆ تۆڵە سەندنەوە خەڵك پێیان ووت: لەئەمیر خۆش بە، ووتی: وەڵڵاهی لەبەر خاتری کەس لێی خۆش نابم، ئەبو موسا چۆن ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) بۆی نووسیبوو بۆی دانیشت و بەکابرای ووت: تۆلەی خۆت بکەرەوە، ئینجا کابرا سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە و ووتی: خوایە شاهێد بە ئەوە لێی خۆش بووم.



# ٩١- ئەگەر کۆمەڵگە ئیسلام بێ

لەسەردەمی خیلافەتی ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) ئیمامی عومەری کردە قازی شاری مەدینەی پایتەخت، ئیمامی عومەر (رضی الله عنه) ماوەیەکی درێژ لەم پیشەیە مایەوە، بەڵام کەس رۆژێك لەرۆژان نەهات شکات لەیەکێکی تر بکا، بۆیە داوای لەئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) کرد ئەم کارەی لێ وەربگرێتەوە و بیدا بەیەکێکی تر، ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) لێی پرسی: ئایا کارەکەت قورسە بۆیە وازی لێ دەهێنی؟

ووتی: نەخێر ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا، بەڵکو لەبەر ئەوەمە پێویستیان بەقازی نییە.. ئەوانە دەزانن هەریەکەیان چەند مافی هەیە بۆیە داوای زیاتر ناکا وەدەزانێ چ ئەرکێکی لەسەرە بۆیە لەجێ بەجێ کردنی بەدوا ناکەوێ، ئەوانە هەریەکەیان چی بۆ خۆی پێ خۆش بێ هەمان شت بۆ برایەکەی پێ خۆشە، ئەگەر یەکێکیان دیار نەبێ بەسەری دەکەنەوە، ئەگەر نەخۆش کەوت سەردانی دەکەن، ئەگەر هەژار بوو دەستی دەگرن، ئەگەر شتێکی پێویست بوو یارمەتی دەدەن، ئەگەریش بەڵایەکی تووش بوو دڵی دەدەنەوە، ئایینیان ئامۆژگارییانە، رەوشتیان ئەمر کردنە بەچاکە و رێگرتنە لەخراپە.. کەواتە لەچی لێك گیر دەبن و لەچی پێویستییان بەقازی دەبێ؟!!

## ٩٢- جلی عومەر

حەفصەی کچی ئیمامی عومەر (رضی الله عنە) لەوکاتەی باوکی خەلیفە بوو پێی ووت: بابە بۆچی جلێکی باشتر لەبەر ناکەی لەمەی وا لەبەرتە، وا خوای گەورە جیهانی بۆ کردوویەوە و داهات زۆر بووە؟ هەروەها زۆری تر هەبوون هەمان شتیان بەئیمامی عومەر (رضی الله عنە) دەووت.

ئیمامی عومەر (رضی الله عنە) وەڵامی دانەوە: نموونەی من لەگەڵ ئێوە وەکو نموونەی ئەو کۆمەڵەیە کەبۆ سەفەرێك دەردەچن و پارە و پووڵی خۆیان دەدەنە یەکێکیان سەرفی بکا، ئایا دەبی کابرا بچێ هەندێ لەو پارەیە بۆ خۆی ببات؟ ووتیان: نەخێر، ووتی هەمان شت بۆ منیش نابێ.

## ٩٣- بەتەمەن نییە

چەند ڕۆژێك بەر لەکۆچی دوایی، پێغەمبەری پێشەوا (صلى الله عليه وسلم) سوپایەکی ئامادە کرد تا بەرەو وڵاتی شام و فەلەستین بچێ.

سوپایەکە زۆربەی موسڵمان و یارە نزیکەکانی پێغەمبەری تیابوو بەکۆچەر و یاریدەدەرەکان لەوانە: ئەبوبەکر، عومەر، ئەبو عوبەیدە، سەعد... وەهی تر، بەڵام پێغەمبەری خوا سەرکردایەتییەکەی دایە دەست ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە کەلەوکاتەدا تەمەنی لەهەژدە ساڵ کەمتر بوو.

هێشتا سوپایەکەی شاری مەدینەی بەجێ نەهێشتبوو، هەندێ موسڵمانی ساویلکە دەیانوت: چۆن دەبێ منداڵێکی ئاوا بکرێتە فەرماندەیەکی سوپایەکی ئاوا لەکاتێکدا ئەو هەموو کۆچەر و یاریدەدەرە بەرزەی تیایە؟ کاتێ ئەم ڕەخنەیە گەیشتەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر دڵی شکا و فەرمووی:

ئەی خەڵکینە دەبینم رەخنەتان لەوە گرتووە کەئوسامەم کردۆتە سەرکردە؟ بەخوای ئەگەر رەخنەتان لەوە گرتبێ ئەوە مانای ئەوەیە پێشتریش رەخنەتان لەوە گرتووە کەزەیدی باوکیم کردە سەرکردە، بەخوا زەید شایەنی سەرکردایەتی بوو، کوڕەکەیشی هەر شایانیەتی و من زۆرم خۆش دەوێ و هیوای هەموو خێر و چاکەیەکی لێ دەکرێ.. ئەوجا بەجوانی لەگەڵی بجولێنەوە چونکە لەپیاوە چاکەکانە.

پاش ئەم ووتارەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) موسڵمانەکان پەشیمان بوونەوە، پاشان سووپایەکە دەستی کرد بەڕۆیشتن.

## ٩٤- موصعەب لەمەدینە

کۆچ کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەشاری مەککە بۆ شاری مەدینە رووداوێکە لەرووداوە هەرە مەزنەکانی ئیسلام.

ئەم کۆچ کردنە رێرەوی بانگەوازەکەی بەتەواوی لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تەواو جیا گۆڕی.. سەرەتا بوو بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی..

بەڵام ئایا کەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڕیاری دا کۆچ بکەن بۆ شاری مەدینە، خەڵکی ئەو شارە لەسەر چ ئایینێك بوون؟ چۆن رێگەیان دا بەو ئایینە نوێیەوە بچنە ناویان بیحەوێننەوە؟

بێ گومان پێش ئەوەی ئەم بڕیارەی کۆچکردن بدرێ خەڵکی شاری مەدینە زۆربەی هەرە زۆریان موسڵمان ببوون و رێگە بۆ کۆچکردنەکە خۆش کرابوو وە ئەوەی کەرۆڵێکی زۆر زۆر گەورەی لەم موسڵمان بوونەی خەڵکی مەدینە دیت پاڵەوانی مەزن و ناسیاوی ئیسلام موصعەبی کوڕی عومەیر بوو.

# ٩٥- موسڵمان وورەی بەرزە

پاش پەیمانی یەکەمی عەقەبە موسڵمانەکانی مەدینە ئەوانەی پێش کۆچ کردنە بوونە موسڵمان داوایان لەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کرد یەکێکیان بۆ بنێرێ فێری قورئان و ئایینیان بکا پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) موصعەبی لەگەڵ ناردن لەوێ لەماڵی ئەسعەدی کوڕی زرارە میوانی بوو.

موصعەب نامۆ (غەریب) و تەنها بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر ئازایانە ئایینی ئیسلامی لەناو خەڵکەکە بڵاو دەکردەوە و هەرگیز هەستی بەتەنیایی و نامۆیی نەدەکرد چونکە ئەو دەیزانی خوای گەورە هەمیشە لەگەڵیەتی.

ڕۆژێك لەگەڵ ئەسعەد بۆ ناو باخێك دەردەچوون لەوێ کۆمەڵێك موسڵمان دەورەیان لێ دابوون فێری ئایینیان دەکردن. لەو کاتەشدا سەعیدی کوڕی مەعاذ کەسەرۆکی (ئەوس) و ئامۆزاکەی ئەسعەدی کوڕی زرارە بوو، لەگەڵ ئەسیدی کوڕی خضیری سەرۆکی بنەماڵەی (عبدالاشهل) کەهەردووکیان بت پەرست بوون بەرەو ڕوویان دەهاتن.

سەعد بەئەسیەدی ووت: بۆ ناچی بۆ لای ئەو دوو پیاوە کەدەیانەوێ سەر لەمناڵ و نەفامەکانمان تێك بدەن و شێتیان بکەن، دەریان بکەی و قەدەغەیان بکەی لەم جۆرە کارە.. خۆ ئەگەر ئەسعەدی کوڕی مامم نەبوایە ئەمزانی چیم لێ ئەکرد.

ئەسیەد نێزە (حربە)کەی بەدەستەوە گرت و ڕووی تێ کردن، کەهاتە سەریان ڕاوەستا و ووتی: بۆچی هاتوونە ناومان و سەر لەمناڵ و نەفامەکانمان دەشێوێنن.. ئەگەر گیانی خۆتان خۆش ئەوێ بڕۆن واز لەو کارە بهێنن.

تەماشاکەن ئەم جۆرە قسەیە لەکابرایەکی سەرۆك هۆز و بەم هەڕەشە و گوڕەشەوە بووترێتەوە یەکێکی نامۆ دەبێ چەند تیژ و ترسێنەر و دڵ ساردکەر بێ؟ بەڵام ئایا موسعەب شەرم گرتی و وازی هێنا؟ ئایا بەم قسانەی شاری بەجێ هێشت؟ نەخێر بەڵکو هەمان دانیشتنیشی بەجێ نەهێشت و هەستی بەهیچ کەم و کوڕییەکیش نەکرد، زۆر مەردانە و لەسەرخۆ ووتی: کاکە گیان.. تۆ دانیشە و هەندێ گوێمان لێ بگرە، ئەگەر بەدڵت بوو لێمان وەربگرە ئەگەر پێشت ناخۆش بوو چی ئەڵێی وادەکەین، ئەسیەد دانیشت و موصعەب باسی ئیسلامی بۆ کرد و هەندێ قورئانی بۆ خوێند، ئەسیەد زۆری بەلاوە جوان بوو و خوا ڕێنموویی کرد و موسڵمان بوو.

ئینجا ووتی: یەکێکم لەگەڵە ئەویش سەرۆکی بنەماڵەی خۆیەتی گەر ببێتە موسڵمان بنەماڵەکەش دەبن بەموسڵمان وا دەچم بۆتانی دەنێرم.

سەعد هەر لەڕێگا بەئەسیەدی ووت: بەخوا بەڕوویێکی جیا گەڕایەوە.. ئینجا ئەسیەد ووتی: بەخوا خراپیان تیا نابینم، سەعد ڕقی هەڵسا و بەرەو ڕوویان هات، کەگەیشتە سەریان ووتی: ئەسعەد ئەگەر خزمایەتی لەنێوانمان نەبوایە تۆ نەت ئەتوانی ئەم پیاوە بێنی لەناو ماڵی خۆمان لەڕێ لامان دا.. موصعەب دیسان لەسەرخۆ ووتی: تۆ بۆ دانانیشی نەختێ گوێم لێ بگری.. ئەگەر قسەکانمت بەدڵ بوو ئەوا وەری بگرە ئەگەر نا بۆ کوێ ئەڵێی ئەچم، ئینجا هەندێ قسەی بۆ کرد دەربارەی ئایینی ئیسلام و هەندێ قورئانی بۆ خوێند.. لەئەنجامدا سەعد موسڵمان بوو، وەچوو بنەماڵەکەی خۆیشی بۆ ئیسلام بانگ کرد ئەوانیش هەموویان بوونە موسڵمان.

ئینجا زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی شارەکە بوونە موسڵمان.

... ئەگەر قوتابی ڕاستەقینەی قورئان بێ ئەوا خزمەتی ئەکا.. وەهەرگیز پەست نابێ، نەشار شاری خۆیەتی، نەهیچ کەسی لەوێ هەیە، نەهەندە دەوڵەمەندە، نە...هتد، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا دێ و بەبێ ترس ئەو شتە نوێیە بڵاو دەکاتەوە و هەست بەهیچ کەم و کوڕییەك و هیچ ناخۆشییەکیش ناکات.

## ٩٦- پەروەردە بوونی قورئان

لەساڵی داهاتوو کەخەڵکی مەدینە بۆ حەج کردن هاتنە مەککە موصعەبیش لەگەڵیان گەڕایەوە مەککە.

بەڵام موسعەب بەوەی کەنزیکەی ساڵێکە شاری خۆی بەجێ هێشتووە، نەچۆوە ماڵێ سەر لەدایك و باوکی بدات، بەڵکو یەکسەر بۆ ماڵی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چوو و هەواڵ و دەنگ و باسی کارەکەی خۆی لەمەدینە بۆ باس کرد، وەچۆن ئەنصارەکان بەخێر هاتنە ناو ئایینی ئیسلام، وەمزگێنی دایە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەربارەی دواڕۆژی ئایینی ئیسلام لەو شارە، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) زۆر کەیفی بەم هەواڵانەی موصعەب هات.

پاشان هەواڵ گەیشتەوە دایکی کەگوایە موصعەب هاتۆتەوە مەککە دایکی بەدوای نارد پێی ووت: دەگەڕێیەوە شار و یەکەم جار سەر لەدایکت نادەی؟ موصعەب وەڵامی دایەوە وەڵڵاهی هەرگیز ئەو کەسە نیم کەیەکەم جار ناچێتە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

لەبەر ئەوە دایکی دووبارە ویستی بەندی بکات بەڵام موصعەب هەڕەشەی کرد ووتی: ئەگەر بزانم دەتەوێ بەندم بکەی ئەوە قاچم بم گرێ دەیکوژم، ئینجا دایکی وازی لێ هێنا و دەستی کرد بەگریان و پێی ووت: بڕۆ بەڕێی خۆتەوە،

موصعەب ووتی: دایە من ئامۆژگاریت دەکەم و دڵم پێت دەسووتێ شاهیدی بدە و ببە بەموسڵمان، دایکی سوێندی خوارد و ووتی: نایەمە سەر ئەو ئایینەت و خەڵك لۆمەم بکەن ئەقڵم لاواز بێ بەڵام لێت دەگەڕێم، تۆ لەسەر ئایینی خۆت و منیش لەسەر ئایینی خۆم.

پاشان موصعەب بۆ نزیکەی سێ مانگ لەمەککە لەلای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) مایەوە ئینجا دووبارە بۆ مەدینە کۆچی کرد و بەمەش بووە یەکەم کەس کەبۆ مەدینە کۆچی کردبێ.

## ڕێکەوتننامەی حودەیبیە

لەساڵی شەشەمی کۆچی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەحودەیبیە لەگەڵ قورەیشییەکان ڕێککەوتننامەیەکی مۆر کرد کەهەر بەناوی (ڕێککەوتننامەی حودەیبیە) ناسراوە بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە:

١- دە ساڵ جەنگ لەگەڵ یەکتری ناکەن.

٢- هەرکەسێ لەقورەیش بەبێ پرسی خزم و کەس و کاری بێتە لای موحەممەد ئەوا دەبێ بینێرێتەوە مەککە، وەهەر موسڵمانێ چووە لای قورەیش ئەوا ناچار نییە بیگەڕێنێتەوە.

٣- هەر خێڵێك بۆی هەیە ببێتە هاوپەیمانی موحەممەد یان قورەیش.

٤- ئەم ساڵ موحەممەد و موسڵمانەکان بەبێ حەج و عومرە دەگەڕێنەوە و ساڵێکی تر دێنەوە، بەمەرجێ تەنها چەکی کاروانیان پێ بێ و دوای ئەوە قورەیش لەمەککە دەردەچن ئەوجا دێنە ناوی و سێ ڕۆژی تیا دەمێننەوە.

لەم ڕێککەوتننامەیە و بەسەرهاتەکانی زۆر بەند و وانە وەردەگرێ، وەزۆر قوتابی قورئان ڕۆڵی تیا بینی، وەپشت خوا هەندێکیان لێ باس دەکەین.

## ٩٧- دەستت لادە[1]

ئەم ڕێککەوتنە پاش وتوێژ (مفاوضات)ێکی زۆر و پاش چەندەها دانیشتن لەنێوان پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نوێنەری قورەیش مۆرکرا، جا یەکەم نوێنەری قورەیش لەم ووتوێژە عروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بوو.

عروە بەپێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)ی ووت: موحەممەد ئەوە چییە سوپایەکت لەهەتیو و مەتیو هێناوە ئەتەوێ هێلانەکەی خۆت بڕوخێنی خزمەکانت لەناو بەریت؟ بەخوا لەبەر چاومانە هەر جەنگ ڕوویدا ئەمانە هەمووی ڕادەکەن و تۆ بەجێ دێڵن: خۆ قورەیش گەورەترین سوپای کۆکردۆتەوە، ئیمامی ئەبوبەکر (رضی الله عنه) پێی ووت: دەستت بەگونی (لات) [2] ئێمە چۆن پێغەمبەر بەجێ دێلین، عروە ووتی: ئەوە کێیە؟ ووتیان: ئەبوبەکرە، ووتی: بەخوا ئەگەر پیاوەتی بەسەرمەوە نەبوایە وەڵامم ئەدایەوە، پاشان عروە کەوتە دواندن و قسە کردن لەگەڵ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەهەر کەقسەی ئەکرد دەستی ئەبرد بۆ ڕیشی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم).

موغیرەی کوڕی شوعبەش کەبەسەرسەری پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) وەستا بوو بەقۆناغی شیرەکەی ئەیدا لەدەستی و ئەی ووت دەستت لابە،

---

[1] لەژیانی پێغەمبەری مەزن، عبدالعزیز پارەزانی، وەرگیراوە.

[2] بتێکی گەورەی کافرەکان بوو.

عروە سەری بەرز کردەوە ووتی: ئەمە کێیە؟ ووتیان ئەوە (موغیرە)یە، ووتی ئەی ستەمکار خۆ دوێنێ من شورەی تۆم شۆری[1].

## ٩٨- سەرکەوتن بوو

موسڵمانەکان بەم رێککەوتنە زۆر پەست و ناڕەحەت بوون و دەیان ووت: هەرچی سوهەیل[2] ووتی: پێغەمبەر رازی بوو ووتی باشە، هەروەها دەیان ووت: ئەو رێککەوتنە هیچ لەبەرژەوەندی ئێمە نییە و تەنها قورەیش سودی لێ وەردەگرن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەکۆتایی دا رایان هاتە سەر رای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەرێککەوتنەکە رازی بوون.

شایانی باسە خوای گەورەش ئایەتی ناردە خوارەوە و ئەم رێککەوتنەی بەسەرکەوتن لەقەڵەم دا، لەراستیشدا هەروا بوو، چونکە موسڵمانەکان لەپاش ئەم رێککەوتنە توانیان ئایینەکەیان بەرەو زۆربەی زۆری لایەنەکانی دوورگەی عەرەبی بڵاو بکەنەوە و خەڵکێکی زۆر بوونە موسڵمان، ئەوەش چونکە لەم ماوەیەدا ترسیان لەقورەیش نەبوو بەکەیفی خۆیان مەفرەزەیان بەم لاو بەولادا دەنارد.

---

(١) مغیرە لەپێش ئیسلام بوونیا سیانزە کەسی ئەقەفی ئەکوژێ و عروە خوێنیان ئەدا تا جەنگ روو نەدات.

(٢) سوهەیلی کوڕی عەمری کەپاش عروە ئەو وتوێژەکەی لەجیاتی قورەیش دەکرد و هەر ئەویش مۆری کرد.

ئەو رێککەوتنە لەرووی رامیارییەوە هەر سەرکەوتن بوو بۆ موسڵمانەکان، چونکە بەم رێککەوتنە قورەیش و بت پەرستەکان دانیان بەقەوارەی ئیسلام نا و بەناچاری ملیان بۆ کەچ کرد.

## ٩٩- ئارام بگرن

لەکاتی نووسینی رێککەوتننامەکە ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیلی کوڕی عەمر هات و پەنای هێنایە بەر موسڵمانەکان و ووتی: من موسڵمانم و لەلای ئێوە دەبم کەسوهەیل کوڕەکەی خۆی دیت هەستا دەستی کرد بەلێدانی و ملی گرت و رووی کردە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و ووتی: ئەی موحەممەد پێش هاتنی کوڕەکەم ئێمە رێککەوتننامەکەمان مۆر کرد، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ووتی: راست دەکەی، بەم پێیە بەندی دووەمی رێککەوتننامە سوهەیل کوڕەکەی خۆی راکێشا و بەرەو مەککەی بردەوە ئەبو جەندەلیش هاواری کرد ئەی کۆمەڵی موسڵمانان چۆن دەهێڵن بمباتەوە بۆ ناو بت پەرستەکان و لەوێ لەئایین لام ببەن؟ موسڵمانەکان بەم هاوارە زیاتر دڵ پەست بوون، بەڵام پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) رووی کردە ئەبو جەندەل و دڵی دایەوە و مزگێنی دایێ کەخوای گەورە دەرگایەك بۆ ئەو و ئەوانەی تری وەکو ئەو کەلەمەککە ماون دەکاتەوە، وەپێی ووت ئارام بگرە.

# ١٠٠- ئەبوو بەصیری پاڵەوان

پاش گەڕانەوەی موسڵمانەکان بۆ مەدینە، زۆری پێ نەچوو بەڵێنەکەی پێغەمبەر هاتە دی کەبەئەبو جەندەلی دابوو کەخوای گەورە بەم زوانە دەرگایەك دەکاتەوە، ئەوەبوو ئەبوو بەصیر (عوتبەی کوڕی ئەسیەد) لەمەککە بووە موسڵمان و بەبێ پرسی خزمەکانی هاتە مەدینە، ئەوانیش نامەیەکیان بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) نووسی و دوو کەسیان ناردە لای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کەبەپێی رێککەوتننامەکە ئەبوو بەصیر بگەڕێنێتەوە.

پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویە ئەبو بەصیر: وەك دەزانی ئێمە لەگەڵ قورەیش پەیمانمان بەستووە و ئێمە ئایینەکەمان رێگەمان نادا پەیمان بشکێنین.. دەبێ بچیەوە ناو خزمەکانت. ئەبو بەصیر ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا دەمنێرییەوە ناو بت پەرستەکان لەئایین لام بدەن؟ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی چار نییە، هیوام وایە خوای گەورە دەرگایەك بکاتەوە.

ئەبو بەصیر چاری نەما و لەگەڵ دوو کەسەکە گەڕایەوە.

لەرێگادا بیری لەچارەنووسی خۆی کردەوە.. ئەگەر بچمەوە ناویان بەخوای دەبێ مل بۆ ئەو بت پەرستانە کەچ بکەم، ئێ ئایینەکەشم رێگەی ئەوە نادا، هەستا بەهەر فێڵێك بوو شمشێرەکەی لەیەکێکیان سەند و کوشتی و ئەوەی تریش لەترسان رای کرد، پاشان بەخۆی گەڕایەوە مەدینە و بەپێغەمبەری ووت: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ پەیمانەکەی خۆت جێ بەجێ کرد.. منیش ئایینەکەم رێی پێ نەدام خۆم بدەم بەدەست بت پەرستان و یاریم پێ بکەن، وا دیار بوو پێغەمبەریش ئیشەکەی ئەبو بەصیری پێ خۆش بوو.



دوای ماوەیەك ئەبو بەصیر سەرنجی دا تازە نابێ لەمەدینە بێ.. ئێ خۆ ناچێتەوە مەککەش، لەبەرئەوە زۆر بەدڵ تەنگی هەستا مەدینەی بەجێ هێشت و بەرەو کەناری دەریا کەوتەڕێ هەتا گەیشتە جێگایەك کە (العیص)ی پێ دەڵێن و دەکەوێتە سەر رێگای مەککە و وولاَتی شام و کاروانەکانی قورەیش هەمیشە بەوێ رەت دەبوون، ئەبو بەصیر دابینابوو کەزەحمەتە جارێکی تر بتوانێ بچێتەوە ناو موسڵمانەکان و ئەو هیوایەی بڕا و زۆر غەمی خوارد.

کەموسڵمانە هەژار و بێ تواناکانی مەککە بەم شتەیان زانی، ئەوانیش یەکە یەکە دەچوونە لای ئەبو بەصیر هەتا وای لێ هات بوونە دەستەیەك، ئەوجا ئیتر هەر کاروانێکی قورەیشییەکان بەوێ رەت بوایە تالاَنیان دەکرد و هەرکەسێکیشیان بدی بایە ئەیانکوشت.

ئەم دەستەیە قورەیشییەکانیان زۆر بێزار کرد لەئەنجامدا زانیان کەئازاردان و بەستنەوەی موسڵمانەکان پەشیمان ناکاتەوە بۆیە بەناچاری ناردیانە لای پێغەمبەر و کەبەندی دووەم لەپەیمانەکە بسڕێتەوە و بنێرتە دوای ئەبو بەصیر کەرێگەکەی شامیان بۆ بەربدەن و بگەڕێنەوە مەدینە، وەهەرکەسێك لەمەولا دەتوانێ بێتە لای موحەممەد، بەم شێوەیە بەندی دووەم سڕایەوە و بەڵێنەکەی پێغەمبەر هاتە دی.

ئینجا پێغەمبەر نامەیەکی بۆ ئەبو بەصیر نارد و تیایدا مزگێنییەکەی پێ راگەیاند کەئێستا دەتوانن بگەڕێنەوە مەدینە، بەلاَم بەداخەوە کەنامەکە گەیشتە دەستی ئەبو بەصیر، ئەبو بەصیر لەژێر جێگا کەوتبوو و لەسەرەمەرگ بوو و دوا هەناسەی ژیانی هەڵدەکێشا.. پێش ئەوەی نامەکە بخوێنێتەوە ئەمری خوای گەورەی بەجێ گەیاند و نامەکەی کەوتە سەر سنگی.

سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز لێکدانەوەکەی (القران الكريم وتفسيره)، وەزارەتی پەروەردەی عێراق.

٢- ژیانی پێغەمبەری مەزن، مامۆستا عبدالعزيز پارەزانی.

٣- الرسول في قلوب أصحابه، مامۆستا وليد الاعظمي.

٤- أنيس المؤمنين، صفوة سعدالله المختار.

٥- المدخل للدراسة الشريعة الإسلامية، دكتور حمد عبيد الكبيس ودكتور محمد عباس السامرائي و د. مصطفى الزلمي.

٦- سيره مناقب كبار الصحابه، الشيخ نجم الدين محى الدين الگيلانی.

## ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|